# كِتَابُ أُصُولِ السُّنَّةِ

تَصْنِيفُ

الإمام أبي عبد الله محمد بن عبد الله بن أبي زَمَنِين الأندلسي الإلبيري رحمه الله تعالى

(م: ٣٢٤) - (ت: ٣٩٩)

وەرگێڕانی: شاب السني

پێداچونەوەی: مجد الحنبلي

# پێڕست

پوختەیەك دەربارەی نووسەر ........................................................................ 5
دەروازەیەك دەربارەی هاندان بۆ پابەندبوون بە سوننەت و شوێنكەوتنی پێشەوایان .......................... 11
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە صیفات و ناوەكانی الله ............................................. 15
دەروازەی ئیمان هێنان بەوەی قورئان كەلامی الله ـیە ................................................. 24
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە عەرش ...................................................... 27
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە كورسی ........................................................ 30
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە پەردەكان ..................................................... 32
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە دابەزینی الله ................................................... 34
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بەوەی الله لە بەندەكانی دەپرسێتەوە .................................. 38
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە ڕوانین بۆ الله ................................................. 41
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە لەوح و قەڵەم ................................................. 44
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بەوەی بەهەشت و دۆزەخ دروستكراون ................................... 47
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بەوەی بەهەشت و دۆزەخ لەناو ناچن.................................... 50
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە فریشتە چاودێر و پارێزەرەكان......................................... 54
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بەوەی فریشتەی مەرگ ڕۆحەكان دەكێشێت................................ 57
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە پرسیاركردنی دوو فریشتەكە ......................................... 59
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە سزای گۆڕ .................................................... 62
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە حەوز ......................................................... 64
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە تەرازوو ....................................................... 67
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە صیراط........................................................ 70
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە شەفاعەت ..................................................... 72

دەروازەیەك ئیمان هێنان بە دەرهێنانی كۆمەڵێك لە ئاگر........................................................ 75
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە................................................78
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە دەرچوونی دەجال.......................................................... 80
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە دابەزینی عیسا و كوشتنی دەجال ......................................82
دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە قەدەر .............................................................................85
دەروازەیەك دەربارەی ئەوەی كە ئیمان وتە و كردەوەیە........................................................................92
دەروازەیەك دەربارەی تەواوێتی ئیمان و زیاد بوون و كەم بوونی ..................................................95
دەروازەیەك دەربارەی داواكردنی لێخۆشبوون بۆ ئەهلی قیبلە، وە نوێژكردن لەسەر ئەو كەسەی دەمرێت لێیان.................................................................................................................100
دەروازەیەك دەربارەی ئەو فەرموودانەی نەفی ئیمانی تێدایە بە تاوانەكان...................................104
دەروازەیەك دەربارەی ئەو فەرموودانەی كە تێیاندا باسی شیرك و كوفر كراوە ................................ 107
دەروازەیەك دەربارەی ئەو فەرموودانەی باسی نیفاقیان تێدا كراوە.............................................112
دەروازەیەك دەربارەی ئەو فەرموودانەی كە باسی بەرائەتیان تێدا كراوە ........................................ 115
دەروازەیەك دەربارەی ئەو فەرموودانەی كە تاوانێك چوێنراوە بە شتانێك لە خۆی گەورەتر، یان هاوتا كراوە117
دەروازەیەك دەربارەی بەڵێن و هەڕەشە .............................................................................. 120
دەروازەیەك دەربارەی خۆشویستنی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ .................................................. 126
دەروازەیەك دەربارەی پێشخستنی أبو بكر و عمر و عثمان و علي ............................................. 130
دەروازەیەك دەربارەی واجبێتی بیستن و گوێڕایەڵی ..........................................................133
دەروازەیەك دەربارەی نوێژ كردن لە پشت كار بەدەستانەوە ...................................................... 138
دەروازەیەك بردنی زەكات بۆ كاربەدەستان.............................................................................141
دەروازەیەك دەربارەی حەج و جیهاد كردن لەگەڵ كاربەدەستان ............................................... 143
دەروازەیەك دەربارەی نەهی كردن لە دانیشتن لەگەڵ ئەهلی ئارەزوو وە ئەو شتانەی دایان ناوە...........146
دەروازەیەك دەربارەی تەوبە كردن بە ئەهلی ئارەزووەكان، وە جیاوازی ئەهلی عیلم لە تەكفیر كردنیان ..... 154

# پوختەیەك دەربارەی نووسەر



ناو: پێشەوا و پێشەنگ و دونیانەویست أبو عبدالله محمد بن عبدالله بن عيسى بن محمد المري الإلبيري القرطبي ناسراو به إِبنُ أَبِي زَمَنِين شێخ و موفتی قورطوبە.

لە دایك بوونی : **٣٢٤** هـ .

وەفاتی : لە ساڵی **٣٩٩** هـ وەفاتی كردووە رحمه الله .

## مامۆستاكانی :

- باوكی خۆی كە دەكاتە عبدالله بن عيسى
- محمد بن معاوية الأموي
- أحمد بن مطرف الأزدي
- سعيد بن فحلون الأندلسي

- أحمد بن الشامة

- وه لای إسحاق الطيطي فيقهی وەرگرتووه، وه هەندێکی تريش

## قوتابيەکانی :

- أبو عمرو الداني

- أبو عمر بن الحذاء

- هشام بن سوار

- القاضي يونس بن عبدالله بن مغيث

- أبو زكريا القليعي، وه هەندێکی تريش له زانايانی الأندلس

## دانراوەکانی :

- أصول السنة (ئەمەی بەردەستت)

- مختصر تفسير يحي بن السلام

- منتخب الأحكام

- منتخب الدعاء

- المهذب في اختصار ابن مزين للموطأ

- قدوة الغازي

- المقرب في اختصار المدونة

- آداب الإسلام

- حياة القلوب في الزهد، وه هەندێکی تریش

## وەسف و ستایش دەربارەی :

- **ابن تیمیة** دەڵێ: ابو عبدالله بن ابي زمنين پێشەوایەکی ناوداره لە پێشەوا مالکیەکان.

- **ابو عمرو المقری** دەڵێ: خاوەنی لەبەرکردن بوو لە مەسائیلەکاندا، وە جوانی نوسین لە فیقهدا، وە کتێبی زۆری هەیە نوسیویەتی دەربارەی: متمانە پێکراوان، دونیا نەویستی، ئامۆژگاریەکان، شتانێکی زۆریان تێدایە و خەڵکیش زۆر پێیانەوە هۆگر بوون و لە وڵاتاندا بڵاو بوونەوە، هۆنراوەی دادەنا و بە وردی و تۆکمەیی صیغەی بۆ دادەڕشت، وە زۆر لە هۆنراوەکانی داخڵی نوسراوەکانی دەکرد، بەوە جوانی دەکردن، وە بەشێکی دیاری هەبوو لە زانستی زمانی عەرەبیدا، لە پاڵ چاکی ڕێنمونی و بەردەوامی ڕێگا، و دەرکەوتنی بەندایەتی و

ڕاستگۆیی زاراوە، و جوانی ڕەوشت، و وازهێنان لە دونیا و ڕوو کردنە بەندایەتی و کردەوەی ئاخیرەت و خۆ دوورگرتن لە دەسەڵاتدار، وە لە خاوەن وەرع و گریان و ملکەچەکان بوو.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أبو عبدالله ی فەقیهـ محمد بن عبدالله بن أبي زمنين وتی :

سوپاس و ستایش بۆ ئەو پەروەردگارەی سوپاسی دەكرێت لەسەر ئەو شتانەی كە وەكو نیعمەت دەیدات، وە سزای هەر كەس دەدات كە سەرپێچی بكات ئەگەر بیەوێت، وە سەڵاوات لەسەر محمد ی كۆتای پێغەمبەران بێت، وە لەسەر هەموو خانەوادەكەی محمد، پەنا بە الله دەگرم لە هەوا و ئارەزووی گومڕاكەر، و كردەوەی قبوڵ نەكراو، وە داوای یەقینی زیاتری لێدەكەین، لەگەڵ یارمەتی لەسەر شوێنكەوتنی ڕێبازی ئیمانداران.

دواتر :

هەندێك لەوانەی كە ئارەزووی شوێنكەوتنی سوننەت و جەماعەتیان هەیە داوایان لێ كردم كە فەرموودە گەلێكیان بۆ بنوسم كە باس لە ڕێبازی پێشەوایان بكات لە شوێنكەوتنی سوننەت و ئەو جەماعەتەی كە چاویان لێ دەكرێ و كۆتایی پێ دەهێنرێ بە بۆچوونیان و ئەوەی كە باوەڕیان پێیەتی، و دەیڵێن دەربارەی ئیمان هێنان بە قەدەر و سزای گۆڕ و حەوز و تەرازوو و صیراط و دروستبوونی بەهەشت و دۆزەخ و گوێڕایەڵی و شەفاعەت و ڕوانین بۆ الله ﷻ

له ڕۆژی قیامەت، تا وەڵام وەربگرێت ئەوەی کە داوای دانانی ئەم کتێبەی کردووه.

وه ئەوەی ویستنی دانانی ئەمەی لا زیاد کردووم ئەو پێداگریەیەیتی کە بینیومە لێی بۆ فێربوونی ئەوەی کە پێویستە فێری بێت، وه بیانوو بوونی نیە بۆ کەسێکی نەزان کە وازبهێنێت لە پرسیارکردن و گەڕان بە دوای بنەماکانی ئیمان و دین و شەریعەتەکانی موسڵمانان، لە کاتێکدا الله ﷻ ئەو کارەی لەسەر پێویست کردووه بە فەرمایشتی: ﴿**فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ**﴾ [**النحل : ٤٣**] .

وه بەهەمان شێوەش بیانوو نیە بۆ زانایەك لە شاردنەوەی ئەوەی پرسیاری لێ دەکرێت لەوەی کە قورئان دەربارەی هاتوەتە گۆ، یان سوننەتێکی جێگیر لە کەسێك کە نایزانێت، لەبەر ئەو بەڵێنەی الله ﷻ وەریگرتووه لە زانایان لە فەرمایشتی: ﴿**لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُ**﴾ [**آل عمران : ١٨٧**]، تەوفیقیش نیە مەگەر لای الله نەبێت، پشتم بەو بەستووه و بۆ لای ئەویش دەگەڕێمەوه.

# دەروازەیەك دەربارەی هاندان بۆ پابەندبوون بە سوننەت و شوێنکەوتنی پێشەوایان



بزانە الله ڕەحمت پێ بکات: سوننەت ڕێنیشاندەرە بۆ قورئان، بە قیاسیش درکی پێ ناکرێت و بە عەقڵ وەرناگیرێت، بەڵکو لە شوێنکەوتنی پێشەوایانەوەیە، وە لەوەی کە کۆی ئەم ئوممەتە لەسەری ڕۆشتوون، الله ﷻ باسی کەسانێکی کردووە و باشترین ستایشی کردوون، کە فەرموویەتی : ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ ۞ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ وَأُولَئِكَ هُمْ أُوْلُوا الأَلْبَابِ﴾ **[الزمر : ١٧ - ١٨]** .

وە فەرمانی کردووە بە بەندەکانی، و فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ **[الانعام : ١٥٣]** .

١ - عبدالله بن مسعود **رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه** فەرمووی: رسول الله ﷺ هێڵێکی بۆ کێشاین، دواتر فەرمووی: (ئەمە ڕێگەی الله یە)، دواتر هەندێک هێڵی تری بۆ کێشاین لە لای ڕاست و چەپی هێڵەکەوە، و فەرمووی: (ئەمانە ڕێگەکان،

لەسەر هەر ڕێگەیەك لەمانە شەیطانێك هەیە بانگەوازی بۆ دەكات) وە ئەمەی خوێندەوە: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ﴾ [الأنعام : ١٥٣] .

٢ - پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هەر كەس پشتی كردە سوننەتەكەم لە من نیە).

٣ - رسول الله ﷺ فەرمووی: (كرداری كەم لە سوننەت باشترە لە كرداری زۆر لە بیدعە).

٤ - رسول الله ﷺ فەرمووی: (سوننەت دوو دانەیە: سوننەتێك لە فەرزەكان، دەست پێوە گرتنی هیدایەتە، وازلێهێنانی گومڕاییە، وە سوننەتێك لە غەیری فەرزەكان، دەست پێوە گرتنی فەزیلەتە، و وازلێهێنانی تاوان نیە).

: ئەم بابەتە لە كتێبی السنة لمحمد بن نصر المروزي بە تێر و تەسەلی ڕوونكراوەتەوە، لەوێ بڕوانە ئەثەری ١١٦ بە دواوە .

٥ - رسول الله ﷺ فەرمووی: (هەموو بیدعەیەك گومڕاییە).

٦ - رسول الله ﷺ فەرمووی: (نزیكە - سەردەمێكتان بەسەردا بێت - پیاوێك بە درۆم بخاتەوە كە پاڵی داوەتەوە لەسەر قەنەفەكەی، فەرموودەی لەمنەوە پێ

دەگات، دەڵێت: ئەی خەڵكینە؛ كتێبی الله، وە واز بێنن لە فەرموودەی رسول الله ﷺ).

٧ - عمر بن الخطاب **رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ** فەرمووی: كەسانێك دێن بە موتەشابیهی قورئان دەتانگرن، ئێوەش بیانگرن بەسوننەت، چونكە هاوەڵانی سوننەت شارەزاترن بە كتێبی الله.

---

: موتەشابیهی قورئان ئەو ئایەتانەن كە بە لەفزەكەیان درك بە تەفسیرەكەیان ناكرێت و زیاتر لە تەفسیرێك هەڵدەگرن، والله اعلم .

لینكی كتێب : **https://t.me/Ktebxanay_salaf1/380**

٨ - عمر بن الخطاب **رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ** فەرمووی: هاوەڵانی ڕا و بۆچوون دوژمنی سوننەتەكانن؛ فەرموودەكانیان بۆ لەبەر ناكرێت، وە لێیان تێكدەچێت و بیریان دەچێتەوە ناتوانن لەبەریان بكەن، وە شەرم دەكەن كاتێك پرسیاریان لێ دەكرێ بڵێن: نازانین، بۆیە بە ڕای خۆیان دژی سوننەت وەستانەوە.

٩ - علی بن أبي طالب عبدالله بن عباس ی **رَضِيَ اللَّهُ عَنْهم** نارد بۆ لای ئەو كەسانەی كە دەرچووبوون - خەواریجەكان - .

پێشی فەرموو: ئەگەر مشتومڕیان لەگەڵت کردبە قورئان ئەوا بە سووننەت مشتومڕیان لەگەڵ بکە.

**١٠** - عبدالله بن مسعود **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** فەرمووی: هیچ ساڵێکتان بەسەردا نایەت ئیللا ساڵی دوای خۆی خراپترە، مەبەستم ئەوە نیە ساڵێك بەفەڕترە لە ساڵێکی تر، یان ساڵێك بارانی زیاترە لە ساڵێکی تر، بەڵکو مەبەستم ڕۆشتنی زاناکان و باشترینەکانتانە، دواتر کەسانێك داهێنان دەکەن، بابەتەکان قیاس دەکەن بە بۆچوونی خۆیان، جا ئیسلام دەڕوخێت و درزی تێ دەچێ.

**١١** - ابن مسعود **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** فەرمووی: شوێن بکەون و بیدعە مەکەن، ئەوەندەتان بەسە.

**١٢** - عثمان بن حاضر الأزدي وتی: بە ابن عباس م وت: ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: دامەزراو بە، شوێن بکەوە و بیدعە مەکە.

**١٣** - ابن عباس **رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما** فەرمووی: هیچ ساڵێك نایەت بەسەر خەڵکیدا ئیللا بیدعەیەکی تێدا دادەهێنن، و سوننەتێکی تێدا دەمرێنن، تا بیدعەکان دەژین و سوننەتەکان دەمرن.

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە صیفات و ناوەكانی الله



محمد - واتە نوسەر - وتی: بزانە كە ئەهلی عیلم بە الله بەوەی پێغەمبەرەكان و نێردراوەكانی هێناویانە، نەزانین بە عیلم دەزانن دەربارەی ئەوەی الله ﷻ ڕاینەگەیاندووە لە بارەی خۆیەوە، وە دەستەوەستان بە ئیمان دەزانن لە بارەی ئەوەی الله بانگەوازی بۆ نەكردووە، لە ڕاستیدا ئەوان كۆتایی بە وەسف كردنی دەهێن بە سیفات و ناوەكانی هەتاوەكو ئەو شوێنەی لە كتێبەكەی كۆتایی پێهێناوە یان لەسەر زمانی پێغەمبەرەكەی ﷺ .

الله ﷻ كە ڕاستگۆترینی بێژەرانە فەرموویەتی: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ ۚ﴾ [القصص: ٨٨] .

وە فەرموویەتی: ﴿قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً ۖ قُلِ اللَّهُ ۖ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ﴾ [الأنعام: ١٩] .

وە فەرموویەتی: ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ ۗ﴾ [آل عمران: ٢٨ - ٣٠] .

وه فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾ [**الحجر: ٢٩**] .

وه فەرموویەتی: ﴿فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾ [**الطور: ٤٨**] .

وه فەرموویەتی: ﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَى عَيْنِي﴾ [**طه: ٣٩**] .

وه فەرموویەتی: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ ۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا بِمَا قَالُوا ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ﴾ [**المائدة: ٦٤**] .

وه فەرموویەتی: ﴿وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ ۚ﴾ [**الزمر: ٦٧**] .

وه فەرموویەتی: ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾ [**طه: ٤٦**] .

وه فەرموویەتی: ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا﴾ [**النساء: ١٦٤**] .

وه فەرموویەتی: ﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ [**النور: ٣٥**] .

وه فەرموویەتی: ﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ﴾ [**البقرة: ٢٥٥**] .

وه فەرموویەتی: ﴿هُوَ الأَوَّلُ وَالآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ﴾ [**الحديد: ٣**]، نمونەی ئەمانە لە قورئاندا زۆرن.

وه ئەو ﷻ (نوری ئاسمانەکان و زەویە) هەروەکو چۆن هەواڵی ئەمەی داوه سەبارەت بە خۆی، وه ئەو (ڕووخسار، و نەفس) ی هەیە لەگەڵ جگە

لەمانەش، بەو جۆرەی کە وەسفی خۆی پێ کردووە، وە ئەو دەبیستێ و دەبینێت، وە قسە دەکات، یەکەمە و هیچ شتێك پێش ئەو نیە، وە کۆتایە و دەمێنێت بۆ غەیری کۆتاییەك، هیچ شتێك دوای ئەو نامێنێ، وە ئەو ئاشکرا و بەرزە و لەسەرروو هەموو شتێکەوەیە کە دروستی کردووە، وە پەنهانە و زانایە هەموو شتێك وە عیلمەکەی دروستکراوەکانی گرتۆتەوە، ﴿**وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ**﴾، زیندوو و هەڵسوڕێنەرە: ﴿**لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ**﴾ [**البقرة: ٢٥٥**] .

**١٤** - أبو الظلال چووە لای أنس بن مالك **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه**، پێی فەرموو: ئەی أبا الظلال کەی چاوت توشی کوێری بوو؟

وتی: بیرم نایەت .

فەرمووی: دەی ئایا ئەوەت بۆ نەگێڕمەوە کە پێغەمبەر ﷺ بۆ منی باسکرد لە جبریلەوە علیه السلام لە پەروەردگاریەوە، کە الله فەرموویەتی: (ئەی جبریل، پاداشتی بەندەیەکم چیە کاتێك شتە ڕێزدارەکەیم لێ سەندەوە؟

جبریل وتی: پەروەردگارا، هیچ عیلمم پێنیە جگە لەوەی تۆ فێرت کردووم .

فەرمووی: ئەی جبریل، پاداشتی بەندەیەکم کاتێك شتە ڕێزدارەکەیم لێ سەندەوە بریتیە لە: ڕوانین بۆ ڕووخسارم).

**١٥** - پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئادەم لەگەڵ موسى عليهما السلام مشتومڕی کرد، موسى فەرمووی: ئەی ئادەم، الله تۆی کردە بەهەشتەوە، وە لە ڕۆحی خۆی فوی پیا کردی . . .).

---

: ڕۆح وەکو ڕێزلێنان دراوەتە پاڵ الله و مەخلوقە و لە سیفاتی الله نیە، هەروەکو حوشترەکەی پێغەمبەر صالح کە پێی دەوترێ ناقة الله .

**١٦** - لە عائیشة ی خێزانی پێغەمبەرەوە **رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها** کە گوێی لێ بووە پێغەمبەر ﷺ لە سوجدەدا دەیفەرموو: (تۆ بەو شێوەیەی ستایشی نەفسی خۆتت کردووە).

**١٧** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (الله دروستکراوەکانی دروست کرد، وە بڕیارەکەی براندەوە، وە بەڵێنی لە پێغەمبەران وەرگرت، وە عەرشەکەی لەسەر ئاوە، وە ئەهلی ڕاستی بە دەستی ڕاستی گرت، وە ئەهلی چەپیش بە دەستەکەی تر، وە هەردوو دەستی الرحمن ڕاستن . .) پاشان فەرموودەکەی باس کرد.

**١٨** - رسول الله ﷺ دەرچوو لە ماڵی هەندێك لە خێزانەکانی، بینی حەلەقەیەك لە مزگەوت دروستکراوە، فەرمووی: (من داوام لە پەروەردگارم کرد کە لەگەڵمدا بەشێك لە ئوممەتەکەم بخاتە بەهەشتەوە لەو کەسانەی چاوم پێیان دەگەشێتەوە، بۆیە حەفتا هەزاری پێبەخشیم، پاشان داوای زیاترم

كرد، بۆیە لەگەڵ هەر هەزارێكدا حەفتا هەزاری بۆ زیاد كردم، پاشان داوای زیاترم كرد، ئاماژەی بۆ كردم بە ناولەپی ئاوا و ئاوا) .

أبوبكر فەرمووی: بەسمانە یا رسول الله ﷺ .

عمر فەرمووی: ئەی أبا بكر وازمان لێ بهێنە بابچینە بەهەشتەوە .

أبو بكر فەرمووی: ئەی عمر جا چی دەمێنێتەوە لە دوو مشت لە مشتەكانی الله، ﴿وَالأَرْضُ جَمِيعاً قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ﴾ [الزمر: ٦٧].

**١٩** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (هیچ دڵێك نیە ئیللا لەنێوان دوو پەنجە لە پەنجەكانی پەروەردگارتدایە، هەر كات بیەوێت بیهێڵێتەوە دەیهێڵێتەوە، وە هەر كاتێكیش بیەوێت لای بدات لایدەدات).

**٢٠** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (فریشتەهایەك جێگۆڕكێ دەكەن لە ناوتان بە شەو، وە فریشتەهایەك بە ڕۆژ، كۆدەبنەوە لە نوێژی بەیانی و نوێژی عەسر، دواتر ئەوانەی لە ناوتان بوون بەرز دەبنەوە بۆلای پەروەردگار، پرسیاریان لێ دەكات لە كاتێكدا زاناترە پێیان: چۆن بەندەكانمتان جێ هێشت؟

دەڵێن: جێمان هێشتن ئەوان نوێژیان دەكرد، وە چووین بۆ لایان ئەوان نوێژیان دەكرد).

**٢١** - أبي موسى الاشعري **رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه** فەرمووی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا بووین ﷺ لە ڕێگایەکدا، کاتێك خەڵکەکە نزم دەبوونەوە تەکبیریان دەکرد، وە کاتێکش بەرز دەبوونەوە تەکبیریان دەکرد، رسول الله ﷺ فەرمووی: (ئەی خەڵکینە، هێور بنەوە، ئێوە بانگی کەسێکی کەڕ و ئامادەنەبوو ناکەن).

**٢٢** - أبي هريرة **رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه** فەرمووی: رسول الله ﷺ ڕۆژێك لەناو خەڵکدا دیاربوو، پیاوێك هات، وتی: یا رسول الله ﷺ ئیمان چیە؟ پاشان فەرموودەکەی باس کرد، وە تێیدا بوو: یا رسول الله ﷺ چاکە چیە؟

فەرمووی: (اللّٰه بپەرستیت وەکو ئەوەی دەیبینیت، خۆ ئەگەر تۆ ئەو نەبینیت، ئەو دەتبینێت).

**٢٣** - رسول الله ﷺ ڕۆژێك لەناو خەڵکیدا باسی دەجالی دەکرد، فەرمووی: (اللّٰه کوێر نیە، بەڵام مەسیحی دەجال چاوی ڕاستی کوێرە، چاوی وەکو ترێیەکی تەقیو وایە).

**٢٤** - جبريل عليه السلام بە رسول الله ی ﷺ فەرموو: (ئایا فێری دوعایەکت بەکەم؟ . . ) پاشان دوعاکەی باسکرد، کە لە سەرەتاکەیدا: (ئەی نوری ئاسمانەکان و زەوی . . . ) هەبوو.

محمد وتی: جا ئەمە ئەو سیفاتانەی پەروەردگارمانە کە خۆی وەسفی خۆی پێیان کردووە لە کتێبەکەی، وە پێغەمبەرەکەی ﷺ وەسفی ئەوی

پێکردوون، لە هیچ شتێکیاندا دیاریکردن و چواندن و ئەندازەگیری تێدانیە، پاك و بێگەردی بۆ ئەو کەسەی کە ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١]، چاوەکان نەیانبینیوە تاکو دیاری بکەن بوونی ئەو چۆنە، بەڵام دڵەکان بینیویانە لە ڕاستیەکانی ئیمان هێنان پێی.

**٢٥** - عبدالرحمان بن القاسم وتی: دروست نیە بۆ هیچ کەسێك وەسفی الله بکات بە جگە لەوەی خۆی وەسف پێ کردووە لە قورئاندا، وە دەستی بچوێنێت بە شتێك، وە ڕووی بچوێنێت بە شتێك، بەڵکو دەڵێت: دوو دەستی هەیە بەو شێوەیەی کە وەسفی خۆی کردووە لە قورئاندا، وە ڕووی هەیە بەو شێوەیەی کە وەسفی خۆی کردووە، دەوەستێت لەو شوێنەی کە الله خۆی وەسف کردووە لە قورئاندا، چونکە ئەو ﷻ هاوشێوە و لێکچووی نیە، بەڵکو الله خوایەکە هیچ خوایەك نیە شایەنی پەرستن بێت جگە لەو، وەکو ئەوەی وەسفی خۆی کردووە، وە دەستەکانی کراوەن وەکو ئەوەی وەسفی کردووە: ﴿وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ﴾ [الزمر: ٦٧] بەو شێوەیەی کە وەسفی خۆی کردووە، وە مالك بە گەورەی دەزانی کە کەسێك بەم فەرموودانە باس بکات کە تێیدا: (الله ئادەمی دروست کردووە لەسەر وێنەی خۆی) هەیە، وە بە ضعیفی داناوە.

---

: ئەم فەرموودەیە صحیحە و زانایانی ئەهلی سوننە وەریانگرتووە، بەڵام ئیمام مالك لەبەر هۆیەك ڕێگری كردووە لە بڵاو كردنەوەی، بۆ زانینی ڕاستی بابەتەكە ئەم دوو نامیلكەیەی خوارەوە بخوێننەوە :

https://t.me/Ktebxanay_salaf1/172

https://t.me/Ktebxanay_salaf1/210

محمد وتی: بەرز و بڵندی بۆ ئەوەی وا دەفەرموێت: ﴿**وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا**﴾ [**الأعراف**: ١٨٠].

وە لە فەرموودەیەك لە رسول الله وە ﷺ : (الله نەوەد و نۆ ناوی هەیە . . ) پاشان هەموو فەرموودەكەی باس كرد.

جا ناوەكانی پەروەردگار و سیفاتەكانی جێگیرن لە دابەزیندا - واتە لە قورئاندا - ، وە پارێزراون لە رسول الله وە ﷺ، وە هەموویان غەیری مەخلوقن، وە داهێنراو نین، بۆیە بەرز و پیرۆزی بۆ الله لەوەی مولحیدەكان دەیڵێن بە بەرز و پیرۆزییەكی زۆر.

**٢٦** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (بیرمەكەنەوە لە الله، بەڵكو بیربكەنەوە لە دروستكراوەكانی).

**٢٧** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (شەیطان دێتە لای یەکێکتان دەڵێت: کێ ئاسمانی دروستکرد؟

دەڵێت: الله .

دەڵێت: کێ زەوی دروست کرد؟

دەڵێت: الله .

دەڵێت: کێ الله ی دروست کرد؟

جا ئەگەر یەکێکتان ئەوەی دۆزیەوە با سێ جار بڵێ: ئیمانم هێناوە بە الله و نێردراوەکەی).

# دەروازەی ئیمان هێنان بەوەی قورئان کەلامی الله یە



محمد وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە: کە قورئان کەلامی الله و دابەزێنراویەتی، نە خالقە و نە مەخلوقە، لەوەوە ﷻ دەستی پێکردووە و بۆلای ئەویش دەگەڕێتەوە.

**٢٨** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (ئێوە ناگەڕێنەوە بۆ لای الله بە شتێك خۆشەویستتر بێت لەو شتەی لێوەی دەرچووە) واتە: قورئان.

**٢٩** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (الله ﴿طَهَ﴾ و ﴿يسٓ﴾ ی خوێندەوە هەزار ساڵ پێش ئەوەی ئادەم دروست بکات، جا کاتێك فریشتەکان گوێیان لەو قورئانە بوو، فەرموویان: سەرفرازی بۆ ئوممەتێك کە ئەمەی بەسەردا دادەبەزێت، وە سەرفرازی بۆ ئەو ناخانەی ئەمە هەڵدەگرن، وە سەرفرازی بۆ کەسێك بەمە قسە بکات - واتە بیخوێنێتەوە - ).

**٣٠** - زهیر بن عباد وتی: هەموو ئەوانەی پێیان گەشتووم لە شێخەکان: مالك بن أنس و سفیان بن عیینة و فضیل بن عیاض و عیسى بن یونس و عبدالله بن المبارك و وکیع بن جراح و جگە لەوانیش کە پێیان گەشتووم لە

فەقیهەکانی وڵاتان: مەککە و مەدینە و عێڕاق و شام و میصر و جگە لەوانیش، دەڵێن: قورئان کەلامی الله یە، نە خالقە و نە مەخلوقە، عیلم هیچ سوودی پێناگەیەنێت تا دەزانێت و ئیمان دەهێنێت کە قورئان کەلامی الله یە، نە خالقە و نە مەخلوقە.

ابن وضاح وتی: دروست نیە بۆ کەس کە تەنها بڵێت کەلامی الله و تاکو دەڵێت نە خالقەو نە مەخلوقە، عیلم هیچ سوودی پێ ناگەیەنێت تا دەزانێت و دڵنیا دەبێ کە قورئان کەلامی الله یە، نە خالقە و نە مەخلوقە، لەوەوە ﷻ هاتووە و بۆ لای ئەویش دەگەڕێتەوە، هەر کەسێك جگە لەمە بڵێ ئەوا کافر بووە بە الله ی مەزن.

مسلمة بن القاسم دەڵێت: کەلامی الله یە، دابەزێنراوە، جیایە، نە خالقە و نە مەخلوقە، لەفزمان داخڵی نابێ، تیلاوەی ئێمە بۆی غەیر مەخلوقە، لەبەرئەوەی تیلاوە خودی قورئانە، هەر کەس بانگەشەی ئەوە بکات تیلاوە مەخلوقە، ئەوە بانگەشەی ئەوەی کردووە کە قورئان مەخلوقە، وە هەر کەسیش بانگەشەی ئەوە بکات کە قورئان مەخلوقە، ئەوە بانگەشەی ئەوەی کردووە کە عیلمی الله مەخلوقە، وە هەر کەسیش بانگەشەی ئەوە بکات کە عیلمی الله مەخلوقە ئەوە کافرە.

: ڕۆنەچوون لە بابەتی لەفز زۆر سەلامەتترە، بەڵام لێرە کە دەڵێ تیلاوە خودی قورئانە مەبەستی ئەوە نیە کردەوەی بەندە قورئانەکە بێت، ئەم کۆمەڵەیەش وەکو ئیمام احمد کردەوەی بەندەیان پێ مەخلوق بووە بەڵام بۆیە ئەم قسەیەیان کردووە چونکە کاتێك قورئان تیلاوە دەکرێ بیسەر گوێی لە قورئانەکە دەبێ کە ئەوەیان مەخلوق نیە، بەڵام کردەوەی بەندە لە هەموو کاتێکدا مەخلوقە، باشتر وایە لەم بابەتانە ڕۆنەچین، والله اعلم .

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە عەرش



محمد وتی: لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە کە اللە ﷻ عەرشی دروست کردووە، تایبەتی کرد و بە بڵندێتی و بەرزبوونەوە تایبەتی کرد بەسەر هەموو ئەو شتانەوە کە دروستی کردوون، دواتر بەرز بووەوە بۆ سەری هەر چۆن خۆی بیەوێت، وەکو چۆن هەواڵی ئەمەی داوە دەربارەی خۆی: ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى (٥) لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ ٱلثَّرَىٰ (٦)﴾ **[طه]**

وە لە فەرمایشتی ﴿ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ۚ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا﴾ **[الحديد: ٤]**.

جا پاك و بێگەردی بۆ ئەو کەسەی دوورە بۆیە نابینرێت، وە نزیکە بە عیلم و قودرەتەکەی، بۆیە چپەچپەکانی بیست.

**٣١** - أبي رزين **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** فەرمووی: وتم یا رسول اللە ﷺ پەروەردگارمان لەکوێ بوو پێش ئەوەی ئاسمان و زەوی دروست بکات؟

فەرمووی: (لە العماء بوو، ژێرەوەی هەوا بوو، وە سەرەوەی هەوا بوو، دواتر عەرشەکەی دروست کرد لەسەر ئاو).

محمد وتی: العماء: هەورێکی چڕ و پڕ و داخراو وەکو چۆن خلیل - بن أحمد الفراهيدي - باسی کردووە.

**٣٢** - کعب الأحبار بینیویەتی لەوەی الله دایبەزاندووە بەسەر موسى عليه السلام: الله لەسەر عەرشەکەی بووە لەسەر ئاو، هەر چۆن خۆی بیەوێت، ئاو لەسەر ڕووی بایە لە هەوادا، وە ئەمەش پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات.

**٣٣** - ابن عباس **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿**وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ**﴾ [**الحاقة** : ١٧] .

فەرمووی: ئەوان ئەمڕۆ چوارن، لە قیامەتدا ئەبن بە هەشت پۆل، ئەوانیش " الكروبين" ن، وە ئەوە الله یە ﷻ کە هەڵیان دەگرێت و دەیانگرێت بە قودرەتی خۆی، ئەوان ئەویان هەڵنەگرتووە، بەڵکو بەوە خۆی بە گەورە ڕاگرتووە.

**٣٤** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (ڕێگەم پێ درا کە باسی فریشتەیەك لە هەڵگرانی عەرش بکەم، پێیەکانی لە زەوی خوارەوەدایە، وە لە سەروو

شاخەکانیەوە عەڕش هەیە، وە نێوان نەرمای گوێچکەکانی و شانی، فڕینی باڵندەیەکە بۆ ماوەی حەوت سەد ساڵ).

**٣٥** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێت: (ماوەی نێوان ئەم زەویە بۆ ئاسمانی دونیا پێنج سەد ساڵ ڕێگەیە، وە ماوەی نێوان ئەم ئاسمانی دونیایە بۆ ئاسمانی دووەم پێنج سەد ساڵ ڕێگەیە، وە بەم شێوەیەشە تا ئاسمانی حەوتەم تا عەڕش، بەو شێوەیەی نێوان ئەم دوو ئاسمانە).

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە كورسی



محمد وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە كە كورسی لە بەردەمی عەرشدایە و شوێنی دوو پێیەكانە.

**٣٦** - لە أنس ەوە **رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه**، رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (جبریل هاتە لام ڕۆژی جومعەی بۆ هێنام كە لە شێوەی ئاوێنەیەكی سپی . . ) دواتر فەرموودەكەی باس كرد، وە تێیدا: (پەروەردگار ﷻ لە بەهەشتدا دۆڵێكی لە میسكی سپی داناوە، كاتێك ڕۆژی جومعە دێت، لە بەرزەكانەوە دادەبەزێت بۆ سەر كورسیەكەی، پاشان كورسی دەور دراوە بە چەند مینبەرێك لە زێڕ، ڕازێنراونەتەوە بە گەوهەر، پاشان پێغەمبەران دێن لەسەریان دادەنیشن).

**٣٧** - ابن عباس **رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما** فەرمووی: ئەو كورسیەی كە فراوانیەكەی هێندەی ئاسمانەكان و زەوییە؛ شوێنی پێیەكانە، وە كەس ئەندازەی عەرش نازانێت جگە لەو كەسەی كە دروستی كردووە.

**٣٨** - سلمان الفارسي **رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ** فەرمووی: لە ژێر ئەم ئاسمانە دەریایەك ئاو هەیە كە لێی دەڕژێت، لە ناویدا گیانداری تێدایە وەك ئەوانەی لە دەریاكانی خۆتان هەن، وە لەم دەریایە الله قەومی نوحی غەرق كرد، وە ئەوە ئاوێكە الله وەكو سزا دایناوە، وە پێش ڕۆژی قیامەت دایدەبەزێنێت، هەر كەس بیەوێ غەرقی دەكات بەوە لە ئاسمانەكان و زەوی، لە دونیا و دوارۆژ، وە بەهەشت و دۆزەخ، لە ناو كورسی، كورسیش ڕووناكیەكە دەدرەوشێتەوە.

**٣٩** - عبدالله بن مسعود **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** فەرمووی: نێوان ئاسمانی دونیا و ئەوەی دوای خۆی مەودای پێنج سەد ساڵە، وە نێوان هەموو دوو ئاسمانێك مەودای پێنج سەد ساڵە، وە نێوان ئاسمانی حەوتەم و كورسی پێنج سەد ساڵە، وە نێوان كورسی و عەڕش و ئاو مەودای پێنج سەد ساڵە، عەڕش لەسەروو ئەو ئاوەوەیە، الله لەسەر عەڕشە، وە ئەو دەزانێت ئێوە لەسەر چین.

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە پەردەكان



محمد وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە كە الله ﷻ جیایە لە دروستكراوەكانی، داپۆشراوە لێیان بە پەردەكان، بەرز و بڵندی بۆ الله لەوەی ستەمكاران دەیڵێن، ﴿كَبُرَتۡ كَلِمَةٗ تَخۡرُجُ مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبٗا﴾ **[الكهف: ٥]** .

**٤٠** - رسول الله ﷺ دەفەرموێت: (بە جبریلم وت ئایە پەروەردگارت دیوە؟ فەرمووی: ئەی محمد نێوان من و ئەو حەفتا پەردەیە لە نور، گەر لە یەكێكیان نزیك ببمەوە دەسوتێم).

**٤١** - عبدالله بن مقسم باسی ئەوەی كرد كە: لە خوار عەرشەوە حەفتا هەزار پەردە هەیە، پەردە گەلێك لە تاریكی كە هیچ شتێك تێی ناپەڕێنێت، وە پەردە گەلێك لە نور كە هیچ شتێك تێی ناپەڕێنێت، وە پەردەگەلێك لە ئاو كە كەس خشەی ئەم ئاوە نابیستێت ئیللا دڵی دادەچڵەكێت، جگە لەو كەسەی الله دڵی دەبەستێ.

**٤٢** - ابن عمر **رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما** فەرمووی: اللّٰه خۆی داپۆشیوه له دروستکراوەکانی بە چوار شت: ئاگر، تاریکی، نور، تاریکی.

**٤٣** - مجاهد وتی: نێوان فریشتەکان و عەڕش حەفتا پەردەیە لە ئاگر، وە حەفتا پەردەیە لە تاریکی، وە پەردەیەك لە نور، و پەردەیەك لە تاریکی.

**٤٤** - أسد وتی: وهب بن منبه لە فەرموودەکەیدا وتی: لە نێوان هەڵگرانی کورسی و هەڵگڕانی عەڕش حەفتا پەردە هەیە لە تاریکی، وە حەفتا پەردە لە سەرما، وە حەفتا پەردەیە لە بەفر، وە حەفتا پەردە لە نور، ئەستوری هەر پەردەیەك لەوانە مەودای پێنج سەد ساڵە، گەر ئەوە نەبوایە ئەوا فریشتەکانی کورسی دەسوتان لە نوری فریشتەکانی عەڕش، ئەی چی بۆ نوری ئەو پەروەردگارەی کە وەسف ناکرێت ڕووخساری.

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە دابەزینی الله



محمد وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە کە الله ﷻ دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا، وە ئیمان بەوە دەهێنن بێ ئەوەی سنورێکی بۆ دابنێن.

**٤٥** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (پەروەردگارمان ﷻ هەموو شەوێك دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا، کاتێك سێیەك کۆتایی شەو دەمێنێت، دەفەرموێت: کێ لێم دەپاڕێتەوە وەڵامی بدەمەوە؟ کێ داوام لێ دەکات پێی ببەخشم؟ وە کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات لێی خۆش بم؟).

**٤٦** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (الله دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا لە نیوەی کۆتایی شەودا) یان (سێیەکی کۆتایی، دەفەرموێت: کێیە ئەوەی لێم دەپاڕێتەوە وەڵامی بدەمەوە؟ کێیە ئەوەی داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات لێی خۆش بم؟ کێیە ئەوەی داوام لێ دەکات پێی ببەخشم؟ تا کاتی فەجر دادێت) یان کاتێك قورئانخوێن لە نوێژی بەیانی دەبێتەوە.

**٤٧** - زهير بن عباد وتى: هەموو ئەوانەی پێیان گەشتووم لەشێخەکان: مالك و سفيان و فضيل بن عياض و عيسى و ابن المبارك و وكيع، دەيان وت: دابەزين حەقە.

ابن وضاح وتى: پرسيارم لە يوسف بن عدي كرد دەربارەی دابەزين؟ وتى: بەڵێ دانی پێدا دەنێم و سنوری بۆ دانانێم، پرسيارم لە ابن معين كرد دەربارەی ئەوە؟

وتى: بەڵێ، دانی پێدا دەنێم و سنوری بۆ دانانێم.

محمد وتى: ئەم فەرموودەيە ڕوونی كردووەتەوە كە الله لەسەر عەرشەكەيەتی، لە ئاسمان دوور نەك زەوی، ئەوەش ڕوونە لە كتێبی الله، و لەو فەرموودەی لە رسول الله وە ﷺ هاتووە.

الله ﷻ فەرموويەتی: ﴿**يُدَبِّرُ الْأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْه**﴾ [**السجدة:** ٥] .

وە فەرموويەتی: ﴿**أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ الْأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ۞ أَمْ أَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ۖ فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ**﴾ [**الملك:** ١٦،١٧] .

وە فەرموويەتی: ﴿**إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ**﴾ [**فاطر:** ١٠] .

وه فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ﴾ [الانعام: ١٨] .

وه بە عیسی علیه السلام ی فەرموو: ﴿إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ﴾ [آل عمران: ٥٥] .

وه فەرمووی: ﴿بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ ج﴾ [النساء: ١٥٨].

**٤٨** - عمر بن الحكم **رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه** فەرمووی: چوومە لای رسول الله ﷺ، وتم: ئەی رسول الله کەنیزەکێکم هەیە ڕانم بۆ دەلەوەڕێنێت، چوومە لای مەڕێك بزر بووبوو لە ڕانەکە، پرسیارم لێی کرد دەربارەی؟

وتی: گورگ خواردویەتی .

خەفەتم بۆ خوارد، وە منیش لە نەوەی ئادەمم، بۆیە زلەیەکم لە ڕووی دا، ئێستە گەردنێکم لەسەرە، ئایا ئازادی بکەم؟

رسول الله ﷺ بە کەنیزەکەکەی فەرموو: (الله لە کوێیە؟)

وتی: لە ئاسمانە .

پێی فەرموو: (ئەی من کێم؟)

وتی: تۆ نێردراوی الله یت .

رسول الله ﷺ فەرمووی: (ئازادی بکە).

: ئەم فەرموودەیە درکێکە لە چاوی هەموو جەهمیە پەکخەرە کافرە زەندیقەکان لە ئەشعەری و ماتوریدیە بەلەعنەتبووەکان، وە هەمیشە زۆر لە خۆیان ئەکەن تا تەحریفی ئەم فەرموودەیە بکەن و بە جۆرێک لە جۆرەکان کوفری خۆیان بشارنەوە، بەڵام هەمیشە ڕووی ڕەشیان دەردەکەوێت، تەماشا بکە کۆیلەیەکی ئافرەت لەبەر ئەوەی فیترەتی پاکە دەزانێت الله عز وجل لە کوێیە، بەڵام هەریەک لە النووي و إبن حجر و الغززالي و عز بن عبدالسلام و عیاض و القرطبي و تەواوی ئەشعەریە زەندیقەکان کافرن بەرامبەر ئەم فەرموودەیە و قبووڵی ناکەن تەنها بە تەحریفە کوفریە کەلامیەکانی خۆیان نەبێت .

محمد وتی: فەرموودەی لەم شێوەیە زۆر زۆرن، جا پاك و بێگەردی بۆ الله یەی کە عیلمی هەیە بەوەی لە زەویە وك چۆن عیلمی هەیە بەوەی کە لە ئاسمانە، هیچ خوایەك شایەنی پەرستن نیە جگە لەو، بەرز و بڵند و مەزنە.

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بەوەی الله لە بەندەكانی دەپرسێتەوە



محمد وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە كە الله ﷻ لە ڕۆژی قیامەت لە بەندەكانی دەپرسێتەوە، پرسیاریان لێ دەكات ڕووبەڕوو.

الله فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ﴾ [المائدة: ١٠٩]

.

وە فەرموویەتی: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍۭ بِشَهِيدٍۢ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا﴾ [النساء: ٤١] .

وە فەرموویەتی: ﴿فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ [الأعراف: ٦] .

وە فەرموویەتی: ﴿أَلَا لَهُ ٱلْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ ٱلْحَٰسِبِينَ﴾ [الأنعام: ٦٢] .

وە فەرموویەتی: ﴿إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّى لَوْ تَشْعُرُونَ﴾ [الشعراء: ١١٣].

ئاخۆ كەس دەپرسێتەوە لە بەندەكان جگە لەو كەسەی درووستی كردوون و بانگی كردوون بۆ عیبادەت، وە كارەكانیانی هەژمار كرد، وە تۆماری كردووە لە سەریان تا پرسیاریان لێ بكات، جا خۆش دەبێت لەوەی كە دەیەوێت و سزای ئەوەش دەدات كە دەیەوێت، وە ئەو بەرز و بڵند و بەتوانایە.

**٤٩** - صفوان بن محرز وتی: لەو كاتەی من دەستی ابن عمر م گرتبوو، پیاوێك بۆی دەركەوت وتی: ئەی باوكی عبدالرحمن چیت بیستووە لە رسول الله وە ﷺ دەربارەی چپە چپ، فەرمووی: گوێم لێ بوو دەیفەرموو: (الله عزوجل لە ئیماندار نزیك دەبێتەوە لە ڕۆژی قیامەت، تا ئەوەی ڕەحمەت و داپۆشینی خۆی دەخاتە سەری، وە دایدەپۆشێت لە خەڵكی، دەفەرمووێت: ئەی بەندەكەم، ئەو تاوانە دەزانی؟

دەڵێت: بەڵێ پەروەردگارا، ئەو تاوانە دەزانی؟

دەڵێت: بەڵێ پەروەردگارا، تا ئەو كاتەی دانی بە تاوانەكانی پێ دەنێ، وە لە نەفسی خۆیدا پێی وایە كە تیاچووە .

دەفەرمووێت: من بۆتم داپۆشی لە دونیا، وە ئەمرۆ من لێت خۆش دەبم، دواتر كتێبی چاكەكانی پێ دەدرێت، بەڵام كافر و موونافیقەكان، بانگ دەكرێن لە سەرووی شاهێدەكانەوە: ﴿**هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ**﴾ [**هود: ١٨**].

**٥٠** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (هیچ یەکێك نییە لە ئێوە ئیللا الله قسەی لەگەڵدا دەکات، لەنێوان الله و ئەودا وەرگێڕ نییە).

**٥١** - لە یحیی وە دەربارەی فەرمایشتی: ﴿**وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ**﴾ [**البقرة: ١٧٤**]، واتە: قسەیان لەگەڵدا ناکات بەو شتەی ئەوان پێیان خۆشە، لە ڕاستیدا قسەیان لەگەڵدا دەکات و لێیان دەپرسێتەوە دەربارەی کارەکانیان وە دەیانگرێت بەوە.

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە ڕوائین بۆ الله



محمد وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە کە ئیمانداران پەروەردگاری خۆیان دەبینن لە ڕۆژی دواییدا، وە ئەو خۆی دادەپۆشێ لە کافر و موشریکەکان بۆیە نایبینن.

الله فەرموویەتی: ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ﴾ [يونس: ٢٦] .

وە دەفەرمووێت: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ۞ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ [القيامة: ٢٢،٢٣].

وە فەرموویەتی: ﴿كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ﴾ [المطففين: ١٥] .

جا پاك و بێگەردی بۆ ئەو کەسەی کە: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ﴾ [الأنعام: ١٠٣].

٥٢ - جرير بن عبدالله البجلي رَضِيَ اللَّهُ عَنْه فەرموویەتی: ئێمە لە لای رسول الله ﷺ بووین لە شەوی چواردەدا، فەرمووی: (ئایا ئەو مانگە دەبینن؟) وتمان: بەڵێ .

فەرمووی: (بەم شێوەیەش پەروەردگارتان دەبینن لە ڕۆژی قیامەتدا، ناڕەحەت نابن لە بینینی).

**٥٣** - أبي هريرة **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** فەرموویەتی: وتیان یا رسول الله ﷺ ئایا پەروەردگارمان دەبینین لە ڕۆژی قیامەت؟

فەرمووی: (ئایا ناڕەحەت دەبن لە بینینی مانگ لە شەوی چواردەدا، کە پەردەی لە پێش نیە؟)

وتیان: نەخێر .

فەرمووی: (ئایا ناڕەحەت دەبن لە بینینی خۆر لە نیوەڕۆدا، کە پەردەی لە پێش نیە؟)

وتیان: نەخێر .

فەرمووی: (ناڕەحەت نابن لە بینینیدا، ئیللا وەك چۆن ناڕەحەت دەبن لە بینینی یەکێك لەوانە).

**٥٤** - پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (کە ئەهلی بەهەشت چوونە ناو بەهەشتەوە، بانگ ئەکرێن: ئەی ئەهلی بەهەشت ئێوە مەوعیدێکتان بۆ هەیە، ئەوانیش دەڵێن: ئەوە چیە؟ مەگەر ڕووخسارمانی سپی نەکرد و نەیخستینە بەهەشت و ڕزگاری نەکردین لە دۆزەخ؟) .

فەرمووی: (جا پەردە لادەبا و دەردەکەوێت، ئەوانیش دەڕوانن بۆی، واللە اللە هیچ شتێکی پێ نەبەخشیون هێندەی ئەوە خۆشەویست بێت لایان) دواتر ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ﴾ .

**٥٥** - أبو بكر **رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه** ئەم ئایەتەی خوێندەوە، یان بەسەریدا خوێندراوە، فەرموی: ئایا دەزانن الزِيَادَةٌ چیە؟ الزِيَادَةٌ: ڕوانینە بۆ ڕووی پەروەردگارمان.

**٥٦** - ابن مسعود **رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه** فەرموویەتی: پەلە بکەن بۆ جومعەکانی دونیا، چونکە اللە ﷻ دەر دەکەوێت بۆ ئەهلی بەهەشت لە هەموو ڕۆژێکی جومعەدا، لەسەر تەپۆڵکەیەك لە کافوری سپی، جا لە نزیکیانەوە لێی وەکو پەلە کردنیانە بۆ جومعەکانی دونیا، وە کەرامەتێکیان بۆ دادەنێ کە پێشتر نەیاندیوە، پاشان دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان دەبینن دووبارە بۆی داناونەتەوە.

یحیی وتی: وە گوێم لە جگە لە المسعودي بووە زیاتری لەمە وتووە، کە بریتیە لە فەرمایشتی: ﴿وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ﴾.

**٥٧** - قتادة دەربارەی فەرمایشتی: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ﴾ وتی: ڕوو گەشن: ﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ وتی: دەڕوانن بۆ اللە.

یحیی وتی: ئیمانداران دەڕوانن بۆی، بەڵام کافران، خۆی دادەپۆشێ لێیان، ئەمەش بریتیە لە فەرمایشتی: ﴿كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ﴾.

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە لەوح و قەڵەم



محمد وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە کە لوح المحفوظ و قەڵەم حەقن، ئیمانیان پێ دەهێنن.

الله فەرموویەتی: ﴿بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ ۝ فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ﴾ [البروج: ٢١، ٢٢] .

وە فەرموویەتی: ﴿وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ [الرعد: ٣٩] .

وە فەرموویەتی: ﴿وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظُۢ﴾ [ق: ٤].

**٥٨** - عبادة بن الولید بن عبادة بن الصامت بۆی باسکردم وتی: باوکم بۆی باسکردم وتی: چوومە لای عبادة پێمی فەرموو: کوڕم من گوێم لە رسول الله ﷺ بوو دەیفەرموو: (یەکەم شت الله دروستی کرد قەڵەم بوو، دواتر پێی فەرموو: بنوسە، جا ئەوەی نوسیەوە کە ڕوودەدا لەو کاتەوە تا ڕۆژی قیامەت . . ) دواتر هەموو فەرموودەکەی باسکرد.

**٥٩** - ابن عباس **رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما** دەربارەی فەرمایشتی: ﴿**نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ**﴾ **[القلم: ١]**

فەرمووی: یەکەم شت اللە دروستی کرد قەڵەم بوو، وە مورەکەبدانی بۆ دروست کرد، کە ئەوەش بریتیە لە النون، پەروەردگاری پێی فەرموو بنووسە، وتی: چی بنوسم پەروەردگارا؟

فەرمووی: قەدەر بنووسە، خێری و شەڕی، جا ئەوەی نوسی کە ڕوودەدا تا قیامەت بەرپا دەبێ.

**٦٠** - وهب دەڵێت: یەکەم شت کە اللە دروستی کرد لوح المحفوظ بوو، مەودای پێنج سەد ساڵ بۆ مەودای پێنج سەد ساڵە، وە لە مرواری سپیە، پەڕەکانی یاقوتی سورن، کەلامەکەی نورە، نوسینەکەشی نورە.

**٦١** - أسد وتی: وهب لە فەرموودەکەیدا وتی: اللە قەڵەمی لە نورێك دروست کرد، درێژیەکەی پێنج سەد ساڵە پێش ئەوەی دروستکراوەکان دروست بکات، بە قەڵەمی فەرموو: بنوسە، قەڵەم وتی: چی بنوسم پەروەرگارا؟ فەرمووی: عیلمەکەم بنوسە دەربارەی دروستکراوەکانم تا قیامەت بەرپا دەبێ، قەڵەمیش ئەوەی نوسی کە لە عیلمی اللە دا ڕوودەدا تا ڕۆژی قیامەت، پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات، وە نوسینی ئەو قەڵەمە لەسەر اللە ئاسانە.

**٦٢** - كعب وتى: نزيكترين فريشته له الله ئيسرافيله، چوار باڵى هەيه، باڵێكى له ڕۆژهەڵاتە، باڵێكى ترى له ڕۆژئاوايه، له سێيەمياندا گومان هەيه، چوارەم له نێوان خۆى و لوح المحفوظ دايه، جا كه الله بيەوێت فەرمانێك به وەحى بنێرێت، لوح المحفوظ دێت تا واى لێ دێت دەدات له ناوچاوانى إسرافيل، سەرى بەرز دەكاتەوە و دەڕوانێت، كه فەرمانەكه نوسراوە، جبريل بانگ دەكات ئەويش دەگاتە لاى، دەڵێت: فەرمانم بەمه پێ كراوە، فەرمانم بەمه پێ كراوە، جا جبريل دانابەزێت له ئاسمانێكەوە بۆ ئاسمانێكى تر ئيللا ئەهلەكەى داچڵەكيون، له قيامەت دەترسن، تا جبريل دەڵێت: حەق لەلايەن حەقەوە، دادەبەزێته سەر پێغەمبەر ﷺ و وەحى بۆ دەهێنێ.

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بەوەی بەهەشت و دۆزەخ دروستكراون



محمد وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە کە بەهەشت و دۆزەخ دروست کراون.

الله فەرموویەتی: ﴿وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ﴾ [البقرة: ٣٥] .

وە فەرموویەتی: ﴿قِيلَ ادْخُلِ الْجَنَّةَ﴾ [يس: ٢٦] .

وە فەرموویەتی: ﴿النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا﴾ [غافر: ٤٦].

**٦٣** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (هەر یەکێکتان کاتێک دەمرێت شوێنەکەی خۆی پیشان دەدرێت بە بەیانیان و ئێواران، ئەگەر لە ئەهلی بەهەشت بێت، ئەوە لە ئەهلی بەهەشتە، وە ئەگەر لە ئەهلی دۆزەخ بێت، ئەوە لە ئەهلی دۆزەخە، پێی دەوترێت: ئەمە شوێنەکەتە تا الله زیندووت دەکاتەوە بۆی لە ڕۆژی قیامەت).

**٦٤** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (ڕۆحی ئیماندار باڵندەیەکە دەنیشێت بە دارەکانی بەهەشتەوە، تا ئەو کاتەی الله دەیگەڕێنێتەوە بۆ جەستەکەی لەو ڕۆژەی زیندووی دەکاتەوە).

**٦٥** - عبدالله بن عباس **رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما** فەرمووی: خۆر گیرا، رسول الله ش ﷺ نوێژی کرد و خەڵکیش لەگەڵیدا بوو، پاشان فەرموودەکەی باس کرد و تێیدا بوو: یا رسول الله ﷺ بینیمانیت شتێکت گرت لەو شوێنەی خۆتەوە، پاشان دوات خست و ماتیتە دواوە، فەرموی: (بەهەشتم بینی، هێشووە ترێیەکم گرت لە ناویدا، ئەگەر بمهێنایە لێتان دەخوارد تا دونیا دەما، وە دۆزەخم بینی، هەرگیز هیچ دیمەنێکم نەدیوە وەك ئەوەی ئەمڕۆ، وە بینیم زۆربەی ئەهلەکەی ئافرەتانن).

**٦٦** - قتادة دەربارەی فەرمایشتی: ﴿**وَجَاءَ مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَى**﴾ وتی: پێم گەشتووە کە ئەو پیاوێك بوو الله ی دەپەرست، دواتر باسی چیرۆکەکەی کرد تا گەیشتە فەرمایشتی: ﴿**فَاسْمَعُونِ**﴾ وتی: جا بەرد بارانیان کرد تا کوشتیان، بحیە چووە بەهەشتەوە، فەرمووی: ﴿**قِيلَ ٱدْخُلِ ٱلْجَنَّةَ قَالَ يَٰلَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ ۞ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلْمُكْرَمِينَ**﴾ [**يس: ٢٧، ٢٨**].

**٦٧** - ابن عباس **رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما** فەرمووی: کاتێك ڕۆحی ئەهلی ئوحود گەیەندران بە الله، کرانە گەدەی باڵندەی سەوزەوە، دەگەڕا بە بەهەشتدا، پاشان دەچووە لای چەند چرایەك لە زێر کە هەڵواسرابوون بە عەڕشەوە،

هەندێکیان وەڵامی هەندێکی تریان دەدایەوە بە دەنگێك کە وایان لێکردین پەلەی بۆ بکەین (ئێمە گەشتینەوە بە پەروەردگارمان جا لێمان ڕازی بوو و ڕازیشی کردین)، وە الله بەڵێنی پێدان کە ئەوە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕابگەیەنێ تاکو ئەویش بەوانی ڕابگەیەنێ، بۆیە الله ئایەتی: ﴿ **وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ۝ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُواْ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ** ﴾ [**آل عمران: ١٦٩، ١٧٠**] دابەزاند.

**٦٨** - لە ابي سعيد الخدري ەوە **رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه** کە رسول الله ﷺ لە فەرموودەی الإسراء دا باسی ئەوەی کرد کە چووەتە سەر ڕێگەی خانەوادەی فیرعەون، کە لەوێوە فرێ دەدرێنە ناو ئاگرەوە، بەیانیان و ئێواران نیشان دەدرێ، جا کە ببینن دەڵێن: پەروەردگارا قیامەت بەرپا مەکە؛ لەبەر ئەو سزایەی الله کە دەیبینن.

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بەوەی بەهەشت و دۆزەخ لەناو ناچن



محمد وتی: وە ئەهلی سوننە باوەڕیان وایە كە بەهەشت و دۆزەخ تیا ناچن، وە ئەهلەكەشیان نامرن، الله فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ الدَّارَ الآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ [العنكبوت: ٦٤] .

وە فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ﴾ [غافر: ٣٩] .

وە فەرموویەتی: ﴿مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ اللَّهِ بَاقٍ﴾ [النحل: ٩٦] .

وە فەرموویەتی: ﴿لَا يَذُوقُونَ فِيهَا الْمَوْتَ﴾ [الدخان: ٥٦].

هەروەها وەكو بەرپەرچدانەوەی جولەكە و بە درۆخستنەوەیان لە وتەكەیاندا فەرمووی: ﴿وَقَالُوا لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلَّا أَيَّامًا مَّعْدُودَةً﴾، ﴿بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَاطَتْ بِهِ خَطِيئَتُهُ﴾ [البقرة: ٨٠، ٨١]، السَيِّئَةً لێرەدا واتە: شیرك، ابن عباس ئەمەی فەرموو.

﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ [البقرة: ٨١].

وه دەربارەی ئەهلی ئیمان فەرمووی: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًاۖ وَعْدَ اللَّهِ حَقًّاۚ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلًا﴾ [النساء: ١٢٢] .

وه فەرمووی: ﴿وَقَالُواْ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٞ شَكُورٌ ۞ الَّذِي أَحَلَّنَا دَارَ الْمُقَامَةِ مِن فَضْلِهِ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ ۞ وَالَّذِينَ كَفَرُوا لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَاۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي كُلَّ كَفُورٍ﴾ [ فاطر: ٣٤، ٣٥، ٣٦] .

وه فەرمووی: ﴿مَّاكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا﴾ [الكهف: ٣] .

وه فەرمووی: ﴿وَمَا هُم مِّنْهَا بِمُخْرَجِينَ﴾ [الحجر: ٤٨].

محمد وتی: خۆ ئەگەر الله ﷻ باسی مانەوەی نەکردایە تەنها لە یەك ئایەت نەبێ، ئەوە بەس دەبوو بۆ کەسێك کە الله سینەی شەرح کردبێ بۆ ئیسلام، بەڵام دووبارەی کردووەتەوە بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەیەکی گەیەندراو.

٦٩ - رسول الله ﷺ فەرمووی: (مردن دەهێنرێت لە ڕۆژی قیامەتدا، دواتر لەسەر صیراط دەوەستێنرێ، دەوترێت: ئەی ئەهلی بەهەشت، ڕادەچڵەکێن و دەترسن دەربکرێن لەو شوێنەی کە تێیدان، دواتر دەوترێت: ئەی ئەهلی دۆزەخ، ئەوان دڵخۆش و خۆشحاڵ دەبن لەوەی دەربکرێن لەو شوێنەی تێیدان، پێیان دەوترێت: ئەمە دەناسنەوە؟

دەڵێن: بەڵێ پەروەردگارا، ئەمە مردنە، جا فەرمانی پێ دەكرێت، سەر دەبڕدرێ لەسەر صیڕاط، دواتر بەهەر تاقمێكیان دەوترێت: نەمریتان پێ دەدرێت لەوەی تێیدان، هەرگیز مردنی تێدا نیە).

٧٠ - رسول الله ﷺ دەیفەرموو: (كاتێك الله ئەهلی بەهەشت دەخاتە بەهەشتەوە، وە ئەهلی دۆزەخیش بۆ دۆزەخ، بانگكەرێك بانگ دەكات: ئەی ئەهلی بەهەشت، نەمریەك كە مردنی تێدانیە، وە ئەی ئەهلی دۆزەخ، نەمریەك كە مردنی تێدانیە، وە هەموویان نەمرن لەوەی تێیدان).

---

: ئەمە لە دوای سەربڕینی مردن دەوترێ، كە ئەو كات جەهەننەم هیچ موسڵمانێكی تێدا نەماوە .

٧١ - علی بن أبي طالب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرمووی: كاتێك ئەهلی بەهەشت بەرەو بەهەشت دەڕۆن، دەدەن بەلای دارێكا، لە ژێرەوەی دوو كانی دێتە دەرەوە، دەخۆنەوە لەیەكێكیان، تێ دەپەڕێت بەسەریاندا بە ڕەونەقی بەهەشت، جا هەرگیز پێستیان ناگۆڕێت، وە قژەكانیان تێك ناچێت دوای ئەوە، دواتر لەوەی تر دەخۆنەوە، ئەوەی لە ناوسكیاندایە لە ئازار و پیسی دەردەچێ، دواتر فریشتەكان پێشوازییان لێ دەكەن، دەرگاوانانی بەهەشت پێیان دەڵێن: ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ﴾ [الزمر: ٧٣].

**٧٢** - عبدالله بن عمر **رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما** فەرمووی: هیچ ئایەتێك دانەبەزیوە لەسەر ئەهلی دۆزەخ توندتر بۆ لە فەرمایشتی: ﴿**فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمۡ إِلَّا عَذَابًا**﴾ **[النبأ: ٣٠]** .

فەرمووی: هەمیشە لە زیادکردنی سزادان.

**٧٣** - سفیان وتی: پێم گەشتووە کاتێك ئەو کەسانە دەردەچن لە دۆزەخ لەوانەی کە دەردەهێنرێن، کەسی تێدا نامێنێتەوە جگە لە ئەهلی نەمری، لەو کاتەدا ئەهلی دۆزەخ دەڵێن: ﴿**رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا مِنۡهَا فَإِنۡ عُدۡنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ**﴾، الله ﷻ دەفەرموێت: ﴿**قَالَ ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ**﴾ [**المؤمنون**: ١٠٧، ١٠٨]، جا کە وای فەرموو، بەسەریاندا دادەخرێ، کەسیان لێی دەرناچێت.

**٧٤** - ابن مسعود **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** فەرمووی: ئەوانەی نەمرن کاتێك لە ئاگردا دەمێننەوە، دەخرێنە چەند تابوتێك لە ئاگر، تێیدا بزماری لە ئاگر تێدایە، دواتر ئەو تابوتانە دەخرێنە چەند تابوتێکی دیکە، پاشان ئەو تابوتانەش دەخرێنە چەند تابوتێکی دیکە، جا نابینن کەس سزا بدرێت لەدۆزەخدا جگە لە خۆیان، ﴿**لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَهُمۡ فِيهَا لَا يَسۡمَعُونَ**﴾ **[الأنبياء: ١٠٠]**.

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە فریشتە چاودێر و پارێزەرەكان



محمد وتی: وە ئەهلی سوننە باوەڕیان هەیە بە پارێزەران، ئەوانەی كرداری بەندەكان دەنووسن.

الله فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ۞ كِرَامًا كَاتِبِينَ﴾ [الانفطار: ١١، ١٢] .

وە فەرموویەتی: ﴿مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ [ق: ١٨].

٧٥ - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (فریشتەكان دەڵێن: پەروەردگارا، ئەوە بەندەكەتە، دەیەوێت تاوان بكات و تۆش باشتر دەیبینیت، دەفەرموێت: چاودێری بكەن، ئەگەر ئەنجامی دا بینوسن لەسەری بە وێنەی خۆی، ئەگەر وازی لێ هێنا بە چاكەیەك بۆی بنوسن، لەبەر ئەوەی ئەو لە ترسی من وازی لێهێنا).

يحيێ وتی: حسن وتی: پارێزەران چوار دانەن چاودێری دەکەن: دوو فریشتەیان بە شەو، دوو فریشتەیان بە ڕۆژ، ئەم چوار فریشتەیە کۆ دەبنەوە لە کاتی نوێژی بەیانیدا، ئەمەش بریتیە لە فەرمایشتێتی: ﴿إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُوداً﴾ [الاسراء: ٧٨].

٧٦ - عائیشة رَضِيَ اللّهُ عَنْها فەرمووی: ئەو زیکرەی کە پارێزەران نایبیستن، حەفتا هێندەی ئەو زیکرە گەورە دەکرێ کە پارێزەران دەیبیستن، کە ڕۆژی قیامەت دێت، الله بە بەندەکەی دەفەرموێت: لای من خەزێنەیەکت هەیە کەس لێی نەڕوانیوە جگە لە من، ئەویش زیکری شاراوەیە.

یحیێ دەڵێت دەربارەی فەرمایشتی: ﴿إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ وتی﴾: دوو فریشتەی نووسەری پارێزەرن.

﴿عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ﴾ [ق: ١٧]، چاودێرێکە چاودێری دەکات.

﴿مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ [ق: ١٨]، واتە: پارێزەری ئامادەبوون، هەر شتێك دەربېڕدرێ دەینوسن.

یحیێ وتی: مجاهد وتی: بگرە ناڵە ناڵیش دەنوسن.

یحیێ وتی: الخليل بن مرة وتی: فەرمان کراوە بەوەی لای چەپ ئەوە بنوسێت کە هاوەڵەکەی ناینوسێت.

**٧٧** - ابن عباس **رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما** فەرمووی: هەموو ڕۆژێکی دووشەمە و پێنجشەممە کرداری بەندەکان پیشان دەدرێت، جا دەیدۆزنەوە بەوە لە کتێبەکەدا هەیە.

یـحیـی وتی: لە تەفسیری الکلبي دا هاتووە: کاتێك کارەکان پیشان دران، گەر بێتو خێر و شەڕیان تێدا نەبێت، دەسڕدرێتەوە و جێگیر ناکرێت، ئەمەش هەموو دووشەممە و پێنجشەممەیەکە.

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بەوەی فریشتەی مەرگ ڕۆحەكان دەكێشێت



محمد وتی: وە ئەهلی سوننە باوەڕیان بەوە هەیە كە فریشتەی مەرگ ڕۆحەكان دەكێشێت.

الله فەرموویەتی: ﴿قُلۡ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلۡمَوۡتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمۡ﴾ [السجدة: ١١].

جا كە ڕۆحی ئیماندارێكی هەڵكێشا دەیبات بۆ لای فریشتەكانی ڕەحمەت، وە كاتێك ڕۆحی كافرێك یان فاجرێكی هەڵكێشا دەیبات بۆ فریشتەكانی سزا، ئەمەش بریتیە لە فەرمایشتی: ﴿تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ﴾ [الأنعام: ٦١]، واتە: وەری دەگرن لە فریشتەی مەرگ دواتر بەرزی دەكەنەوە بۆ لای الله، ئەمەش بریتیە لە فەرمایشتی: ﴿ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۚ﴾ [الأنعام: ٦٢].

٧٨ - مجاهد وتی: زەوی گیراوە بۆ فریشتەی مەرگ، وەكو تەشتێكی لێكراوە، ئەوەی بیەوێت لێی بە دەستی دەهێنێ.

يحيى وتی: والله اعلم، پێم گەیشتووە کە ڕۆحی هەموو شتێك دەکێشێت لە وشکانی و دەریا.

وە پێم گەیشتووە کە فریشتەی مەرگ چەند یارمەتیدەرێکی هەیە، ئەوانەن کە ڕۆحەکە لە جەستەکە دەردەهێنن، تا کاتی دەرچوونەکەی فریشتەی مەرگ دەیکێشێت، وە ئەوان ئەجەلی بەندەکان نازانن، تا لەلایەن الله وە عیلمی ئەمەیان پێ دەگات.

**٧٩** - رسول الله ﷺ ئەمەی خوێندەوە: ﴿**وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ**﴾ **[الأنعام: ٩٣]**، دواتر رسول الله ﷺ فەرمووی: (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، کەستان خۆشحاڵ نابێ بە جیابوونەوەی ڕۆحی لە جەستەی هەتاکو نەبینێ بۆ کام لە دوو جێگاکە دەچێت، ئەوەش ئەو کاتەیە کە مەرگ دادەبەزێتە سەری) پاشان فەرموودەیەکی باس کرد کە درێژی تێدایە، بەڵام تێیدابوو: (فریشتەکان شت بە شت ڕۆحەکە دەگرن، هەتاکو دەگاتە چەناگەی، دواتر کێشانی ڕۆحەکە فریشتەی مەرگ دەیگرێتە ئەستۆ کە ئەو کارەی پێ سپێردراوە)، وە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿**قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ**﴾.

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە پرسیارکردنی دوو فریشتەکە



محمد وتی: وە ئەهلی سوننە ئیمانیان بەوە هەیە کە ئەم ئوممەتە تاقی دەکرێنەوە لەگۆڕەکانیاندا، وە پرسیاریان لێ دەکرێت دەربارەی پێغەمبەرەکەیان ﷺ، بە هەر شێوەیەك کە الله بیەوێت، وە ئەمە بە ڕاست دەخەنەوە بە بێ چۆنێتی.

الله ﷻ فەرموویەتی: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡقَوۡلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَۚ وَيَفۡعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ﴾ [**إبراهيم: ٢٧**].

**٨٠** - لە عائشة وە **رَضِيَ اللّهُ عَنْها** کە رسول الله ﷺ فەرمووی: (تاقیکردنەوەی گۆڕ بە منە، جا کە پرسیاری منتان لێ کرا، نەکەونە گومانەوە)، وتم: یا رسول الله ﷺ چی بکەم کە من ئافرەتێکی لاوازم؟

فەرمووی: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا ...﴾.

٨١ - له عمرو بن دينار ەوە؛ كە رسول الله ﷺ بە عمر ی فەرموو: (ئەی عمر چی دەكەی كە چویتە گۆڕەكەتەوە و دوو تاقیكەرەوەكەی گۆڕ ماتنە لات: منكر و نكیر؟) .

وتی: ئەی منكر و نكیر چین یا رسول الله ﷺ؟

فەرمووی: (دوو فریشتەی ڕەش و شینن، پێ دەنێن بە قژیاندا - چونكە قژیان زۆر درێژە، والله اعلم - , بە كەڵبەكانیان زەوی هەڵ دەگرن، چەكوشێكی گەورەی ئاسنیان پێیە، ئەگەر هەموو ئەهلی مینا كۆببنەوە بۆ هەڵگرتنی ئەوا ناتوانن هەڵیگرن، بەڵام ئەوە لەسەر ئەو دووانە ئاسانترە)، وە شتێكی لە زەوی هەڵگرت، ئەوەش لە من بوو .

عمر وتی: ئەی من ئەو ڕۆژە چۆنم یا رسول الله ﷺ؟

فەرمووی: (لەسەر ئەم حاڵەی ئەمڕۆتی) .

وتی: كەواتە بەس دەبێ بۆیان یا رسول الله ﷺ.

٨٢ - رسول الله ﷺ فەرمووی: (ئەم ئوممەتە لە گۆڕەكانیان تاقی دەكرێنەوە، كاتێك ئیماندار چووە گۆڕەكەیەوە و ماوەڵەكانی پشتیان تێ كرد، فریشتەیەكی هەڕەشە توند دێتە لای، پێی دەڵێ: چیت دەوت دەربارەی ئەو پیاوە؟ دەڵێ: دەڵێم ئەو پێغەمبەر و بەندەی الله یە، فریشتەكە پێی دەڵێ: سەیری جێگەكەت بكە لە ئاگر كە هی تۆ بوو، الله لەوە پەنای دایت و ئەو جێگەیەی

ئاگری بۆ گۆڕیت بەو جێگەیەی بەهەشت کە دەیبینی. هەردووکی دەبینێ، ئیماندار دەڵێ: لێم گەڕێن مژدە بە کەس و کارم بدەم، پێی دەڵێ: ئارام بە، بەڵام دووڕوو کاتێك ئەملەکەی پشتیان تێ کرد دادەنیشرێ و پێی دەوترێ: چیت دەوت دەربارەی ئەو پیاوە؟ دەڵێ: نازانم هەر ئەوە دەڵێم کە خەڵکی دەیڵێن، جا پێی دەوترێ: نەتزانی، ئەمە ئەو جێگەی تۆ بوو لە بەهەشت گۆڕدرا بە جێگەیەك لە ئاگر).

**٨٣** - پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (هەموو بەندەیەك بەو شێوەیەی کە مردووە لە گۆڕەکەی زیندوو دەکرێتەوە).

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە سزای گۆڕ



محمد وتی: ئەهلی سوننە باوەڕیان هەیە بە سزای گۆڕ، الله ئێمە و ئێوەش بپارێزێت لێی.

الله فەرموویەتی: ﴿**فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا**﴾ [**طه: ١٢٤**] .

وە دەفەرموێت: ﴿**سَنُعَذِّبُهُمْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ**﴾ [**التوبة: ١٠١**] .

**٨٤** - عائشة ی خێزانی پێغەمبەر ﷺ ئافرەتێکی جولەکە هاتە لای و پرسیاری لێبکات، پێی وت: الله بتپارێزێت لەسزای ناوگۆڕ.. فەرموودەکەی باسکرد و لە کۆتاییەکەیدا تێیدا بوو: کە رسول الله ﷺ فەرمانی کرد بە خەڵکی پەنا بە الله بگرن لە سزای گۆڕ.

**٨٥** - سعيد بن المسيب دەیوت: نوێژم کرد لە پشتی أبي هريرة لەسەر منداڵێك کە هەرگیز تاوانی نەکردبوو، گوێم لێبوو دەیوت: یا الله بیپارێزە لە سزای گۆڕ.

٨٦ - رسول الله ﷺ فەرمووی: (﴿مَعِيشَةً ضَنْكًا﴾ واتە: سزای گۆڕ).

٨٧ - سعيد بن جبير دەربارەی فەرمایشتی: ﴿مَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥۖ وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ﴾ وتی: واتە لە ناو گۆڕ.

٨٨ - قتادة دەربارەی فەرمایشتی : ﴿سَنُعَذِّبُهُمْ مَرَّتَيْنِ﴾ وتی: واتە سزای دونیا و سزای گۆڕ.

﴿ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ﴾ واتە سزای جەهەننەم.

عبدالملك وتی: تاقیکردنەوە و سزای گۆڕ لای ئەهلی سوننە و ئیمان هێنان بە الله بەهێزە و هیچ گومانێکیان لێیان نیە، هەر کەس بە درۆی خستەوە ئەوە لە ئەهلی بە درۆخستنەوەی الله یە، زەندیقەکانیش بە درۆی دەخەنەوە ئەوانەی باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نیە، سوچێك وتەکانیان دەرکەوت و بینیم بڵاوبووەتەوە لە ناو خەڵکیدا، منیش ترسام لەوەی گومڕا ببن لە دین و ئیمانیان، بۆیە ئاگاداریان بن، چونکە ئەوانەن کە وتیان: ڕۆحەکان دەمرن بە مردنی جەستە. بە مەبەستی بە درۆخستنەوەی سزای گۆڕ و ئەوەی دوای خۆی وایان وت.

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە حەوز



محمد وتی: وە ئەهلی سوننە باوەڕیان هەیە بەوەی پێغەمبەر ﷺ حەوزێكی هەیە، الله پێی بەخشیوە، هەر كەس قومێكی لێبخواتەوە هەرگیز تینووی نابێت لە دوای ئەوە.

**٨٩** - أنس بن مالك **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** فەرمووی: لە ڕۆژێكدا كە رسول الله ﷺ لەناوماندا بوو، تا خەوی لێكەوت خەوێكی كەم، دواتر سەری بەرز كردەوە بە زەردەخەنەوە، وتمان: چی هێناتیە پێكەنین یا رسول الله ﷺ؟

فەرمووی: (كەمێك پێش ئێستا سورەتێكم لەسەر دابەزی)، دەستی كرد بە خوێندنەوە: ﴿**بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ**﴾: ﴿**إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ ۞ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ ۞ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الأَبْتَرُ**﴾.

پاشان فەرمووی: (دەزانن الْكَوْثَرَ چیە؟)

وتمان: الله و پێغەمبەرەكەی زاناترن.

فەرمووی: (ڕووبارێکە پەروەردگارم بەڵێنی ئەوەی پێداوم، خێرێکی زۆری لەسەرە، حەوزێکە ئوممەتەکەم دەگەڕێنەوە بۆی، کوپەکانی هێندەی ژمارەی ئەستێرەکانە، بەندەیەکیش لێیان دادەبڕێ، بۆیە دەڵێم: ئەی پەروەدگارم، ئەو لە ئوممەتی منە، دەفەرموێت: تۆ نازانیت لە دوای تۆ چیان داهێناوە).

**٩٠** - لە ثوبان ی مەولای رسول الله وە ﷺ کە پیاوێك وتی: یا رسول الله ئەو حەوزەت چیە کە قسە دەکەیت دەربارەی؟

فەرمووی: ( - ئەندازەکەی - نێوانی ئەیلەیە بۆ عەممان، خواردنەوەکەی سپیترە لە شیر، وە شیرینترە لە هەنگوین، وە کوپی لەسەرە).

یان فەرمووی: (کوپ گەلێکی لەسەرە هێندەی ئەستێرەکانی ئاسمان، هەر کەس قومێکی لێ بخواتەوە هەرگیز تینووی نابێت لە دوای ئەوە، یەکەمین کەسانێك پێی دەگەن هەژارەکانی کۆچەرانن) .

وترا: ئەوان کێن یا رسول اللّٰه؟

فەرمووی: (قژ ئاڵۆسکاوەکان، جل چڵکنەکان، ئەوانەی دەرگایان بۆ ناکرێتەوە، وە خاوەن نیعمەتەکانیان لێ مارە ناکرێ، ئەوانەی کە ئەو شتە دەبەخشن کە لەسەریانە بەڵام ئەو شتەی بۆ ئەوانە پێیان نابەخشرێ).

**٩١** - له ثوبان ی مەولای رسول الله ـوه ﷺ كه پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (من له دواوەی حەوزەكەمم، خەڵكی لێ دوور دەخەمەوه بۆ خەڵكی یەمەن، من لێیان دەدەم به دارەكەم تا دوریان دەخەمەوه) .

فەرمووی: وه دەربارەی فراوانی حەوزەكه پرسیار كرا له رسول الله ﷺ ؟

فەرمووی: (وەكو نێوان ئەم پێگەیەمه بۆ عەممان)، دواتر دەربارەی خواردنەوەكەی پرسیاری لێكرا؟

فەرمووی: (له شیر سپیتره، وه له هەنگوین شیرینتره، دوو ئاوەڕۆی به درێژایی حەوزەكه تێدایه) یان (ئاوەڕۆكانی له بەهەشتەوەیه، یەكێكیان له زیوه، ئەوەی تریان له زێڕه).

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە تەرازوو



محمد وتی: وە ئەهلی سوننە باوەڕیان هەیە بە تەرازووی ڕۆژی قیامەت.

الله ﷻ فەرموویەتی: ﴿فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ۞ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ۞ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ۞ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ﴾ [القارِعَة: ٦ - ٩]

وە فەرموویەتی: ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا﴾ [الأنبيَاء: ٤٧].

**٩٢** - لە أبو موسی وە وتی: گوێم لە علي بوو دەیفەرموو: رسول الله ﷺ فەرمانی بە عبداللّٰه بن مسعود کرد بەسەر دارێکدا سەربکەوێ و شتێکی بۆ بهێنێت، هاوەڵەکانی سەیری لاوازی قاچەکانیان کرد، بۆیە پێی پێکەنین، فەرمووی: (بە چی پێدەکەنن؟ قاچی عبداللّٰه لەسەر تەرازوو لە ئوحود قورسترە).

**٩٣** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (دوو وشە هەن ئاسانن لەسەر زمان، قورسن لەسەر تەرازوو، خۆشەویستن لای الرحمن: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ).

**٩٤** - له عياض بن جهمان ەوە؛ كە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، وتی: یا رسول الله ﷺ هاتووم بۆ لات تا فێری كارێكم بكەی الله ﷻ بەوە بمخاتە بەهەشتەوە . . جا فەرموودەكەی باسكرد، وە تێیدا بوو: پاشان پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (ئایا دوو وشەت فێر نەكەم كە قورسن لەسەر تەرازوو، ئاسانن لەسەر زمان، الرحمن یش ڕازی دەكەن؟ سُبْحَانَ اللَّه و الحَمدُلِلّه، ئەو دوانە هاوتای یەكترن).

**٩٥** - سلمان الفارسي **رَضِيَ اللّهُ عَنْه** فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەت تەرازوو دادەنرێت، گەر ئاسمانەكان و زەوی دابنرێ لە تاكەیدا ئەوا جێگای دەبێتەوە، جا فریشتەكان دەڵێن: پەروەردگارمان، بەمە كێشانە بۆ كێ دەكەی؟

دەفەرمووێت: هەر كەس لە دروستكراوەكانم كە بمەوێ .

فریشتەكان دەڵێن: پەروەردگارا، بە حەقی پەرستنت نەمان پەرستوویت.

یحیی وتی: وە فەرمایشتی ﴿**فَلَا نُقِيمُ لَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَزۡنٗا**﴾ [**الكهف**: ١٠٥] وەكو فەرمانیشتی ﴿**وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ**﴾ [**المؤمنون**: ١٠٣] وایە.

**٩٦** - زهير بن عباد وتی: ئەوانەی گەشتم لە شێخەكان: مالك و سفيان و فضيل و عيسى بن يونس و ابن المبارك و وكيع بن الجراح، دەیانوت: تەرازوو ڕاستە.

إبن وضاح وتی: پرسیارم كرد له یحیى بن معین دەربارەی؟ وتی: ڕاسته.

محمد وتی: له تەفسیری الكلبي ـدا بینیم: له ابن وضاح ـەوە له ابن عباس ـەوە كه فەرموویەتی: ئەوە تەرازوویەكە زمانێك و دوو تای هەیە.

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە صیڕاط



محمد وتی: وە ئەهلی سوننە باوەڕیان هەیە بە صیڕاط، و بەوەی خەڵکی بەسەریدا تێدەپەڕن لە ڕۆژی قیامەت بە ئەندازەی کردارەکانیان.

**٩٧** - عائشة **رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها** فەرمووی: پرسیارم لە رسول الله ﷺ کرد دەربارەی فەرمایشتی الله ﷻ : ﴿**يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ**﴾ [**إبراهِيم**: ٤٨] ئەو ڕۆژە خەڵکی لە کوێن؟

فەرمووی: (لەسەر صیڕاط).

**٩٨** - لە الحسن البصري ەوە کە بەشێك لە خزمەکانی رسول الله ﷺ بە رسول الله ییان وت: یا رسول الله ﷺ لە ڕۆژی قیامەت پیاو کەسە نزیکەکانی لە یادە؟

فەرمووی: (سێ جێگا هەیە کە هیچ کەس کەسە نزیکەکانی لە یاد نیە، لای تەرازوو، تا سەیر بکات ئاخۆ تەرازووەکەی قورس دەبێت یان سوك، وە لە لای صیڕاط، تا سەیر بکات ئاخۆ تێدەپەڕێت یان تێناپەڕێت، وە لە کاتی وەرگرتنەوەی

نامەكان، تا سەیر بكات ئاخۆ بە دەستی ڕاستی نامەكەی وەردەگرێت یان بە دەستی چەپی).

**٩٩** - عبداللّٰه ابن مسعود **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** فەرمووی: صیڕاط لەسەر جەهەننەمە وەكو تیژی شمشێر وایە، فریشتەكان بە كۆمەڵێك قولاپیان لە ئاسن پێیە، هەر كاتێك پیاوێك بكەوێت دەیفڕێنن، جا ڕیزی یەكەم وەكو بروسكە تێدەپەڕن، وە دووەم وەكو با، وە سێیەم وەكو باشترین ئەسپ، وە چوارەم وەكو باشترین ئاژەڵ، وە فریشتەكان دەڵێن: یا اللّٰه سەلامەتیان بكە سەلامەتیان بكە.

**یحیى** : لە تەفسیری الكلبي دا دەربارەی فەرمایشتی ﴿**يَوْمَ لَا يُخْزِي ٱللَّهُ ٱلنَّبِيَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥۖ نُورُهُمۡ يَسۡعَىٰ بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِمۡ**﴾ [**التحريم**: ٨] وتی: هەموو ئیمانداریك نورێكی پێ دەدرێت، هی هەندێكیان لە هی هەندێكی تریان زۆرترە، بۆیە بەسەر صیڕاط وەكو بروسكە تێدەپەڕن، وە تێیاندایە وەكو غاردانی ئەسپێكی باش تێدەپەڕێ، وە تێیاندایە لە هەوڵداندان، وە تێیاندایە لەسەر سك تێدەپەڕن، كە بریتین لەوانەی كە دەڵێن: ﴿**رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا وَٱغۡفِرۡ لَنَآۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ**﴾.

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە شەفاعەت



محمد وتی: وە ئەهلی سوننە باوەڕیان بە شەفاعەت هەیە.

الله ﷻ فەرموویەتی: ﴿**عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا**﴾ [**الإسراء: ٧٩**]

.

**١٠٠** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (شەفاعەتەکەم بۆ ئەهلی تاوانە گەورەکانە لە ئومەتەکەم).

**١٠١** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (من گەورەی نەوەکانی ئادەمم بە بێ شانازی کردن، وە یەکەم کەسم کە زەوی بۆ شەق دەبێت - واتە یەکەم کەسە لە گۆڕ دێتە دەرەوە بۆ زیندوو بوونەوە - ، وە یەکەم شەفاعەتکارم و یەکەم شەفاعەت قبوڵکراوم).

**١٠٢** - حذيفة **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** دەیفەرموو: الله هەموو خەڵکی کۆدەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەت لەسەر یەك سەکۆ، بەڕوتی و پێ پەتی وەکو چۆن دروست کرابوون، گوێیان لە بانگکەرەکە وایان دەیانهێنێتر بیستن و چاوەکانیان ئەبڵەق

دەكا، وە كەس قسە ناكات جگە بە مۆڵەتی ئەو، جا یەکەم کەس بانگ دەکرێت محمد ە ﷺ، ئەی محمد ﷺ، دەڵێت: (لە خزمەتتدام و شوێنت دەکەوم، وە خێر لە دەستی تۆدایە، شەڕ بۆ تۆ نیە، وە هیدایەتدەر ئەوەیە کە هیدایەتت داوە، وە بەندەکەت لە بەردەستتدایە، لە تۆیە و بۆ لای تۆیە، هیچ پەناگەیەك لە تۆ نیە جگە لە لای تۆ، پیرۆزی و بەرز و بڵندی بۆ تۆ، وە بەرز بویتەتەوە بۆ سەر عەرشەکەت، پاك و بێگەردی بۆ تۆ، پەروەردگاری کەعبە)، دواتر پێی دەوترێ: (شەفاعەت بکە) .

حذیفة فەرمووی: ئەوەش ئەو مەقامی محمودەیە کە الله بەڵێنی پێداوە.

**١٠٣** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (خەڵکی دۆزەخ ڕیز دەکرێن، دواتر گۆشە گیر دەکرێن) .

فەرمووی: (پیاوێکی ئەهلی بەهەشت بە لایاندا تێدەپەڕێت، پیاوێك لەوان پێی دەڵێت: ئەی فلان .

دەڵێت: چیتە؟

دەڵێت: بیرت دێ پیاوێک قومێک ئاوی پێدای لە ڕۆژێکی ئاوا و ئاوادا؟).

فەرمووی: (دەڵێت: ئەوە تۆیت).

فەرمووی: (دەڵێت: بەڵێ) .

فەرمووی: (جا شەفاعەتی بۆ دەكات) .

دەفەرموێت: (وە پیاوێك لەوان بە پیاوێكی ئەهلی بەهەشت دەڵێت: ئەی فڵان بیرت دێت پیاوێک ئاوی دەستنوێژی پێ دایت ڕۆژێكیان ئاوا و ئاوا؟

دەڵێت: ئەوە تۆ بوویت؟

دەڵێت: بەڵێ) .

فەرمووی: (جا شەفاعەتی بۆ دەكات).

# دەروازەیەك ئیمان هێنان بە دەرهێنانی كۆمەڵێك لە ئاگر



محمد وتی: وە ئەهلی سوننە باوەڕیان هەیە بەوەی اللە ﷻ خەڵكانێك لە ئەهلی تەوحید دەخاتەوە بەهەشتەوە دوای ئەوەی ئاگریان بەركەوتووە، بە ڕەحمەتی خۆی و شەفاعەتی شەفاعەتكاران .

اللە ﷻ فەرموویەتی: ﴿رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ﴾ [**الحجر**: ٢].

وە فەرمووی: ﴿فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ﴾ [**المدثر**: ٤٨].

**١٠٤** - رسول اللە ﷺ فەرمووی: (كە ڕۆژی قیامەت هات، پێغەمبەر شەفاعەت بۆ ئوممەتەكەی دەكات، وە شەهید بۆ كەسوكارەكەی، وە ئیماندار بۆ كەسوكارەكەی، وە شەفاعەتی الرحمن دەمێنێتەوە، اللە ﷻ كۆمەڵێك لە ئاگر دەهێنێتە دەرەوە كە سوتاون تێیدا و بوونە بە پشكۆ، جا فەرمانیان پێ دەكرێ بچنە ڕوبارێك لە بەهەشت كە پێی دەوترێ: ژیان، جا دەڕوێن وەكو چۆن

ئەو تۆوانە دەڕوێن کە هەڵگیراون لە ناو قوڕ و پوشدا، دواتر هەڵدەستنەوە و دەڕۆنە بەهەشتەوە، ئەوانە کۆتا کەسانێکن دەچنە بەهەشتەوە، وە نزمترین پلەیان هەیە).

**١٠٥** - ابن مسعود **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** فەرمووی: ئەهلی دۆزەخ بەو کەسانەی کە ئەهلی تەوحیدن و دێنە ناو دۆزەخ دەڵێن: ئەوانە موسڵمانیش بوون، چ سوودێکی پێگەیاندن؟ بۆیە پەروەردگار بۆیان ڕادەوەستێ، دەیانخاتە بەهەشتەوە، لەوکاتەدا: ﴿**يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ كَانُواْ مُسۡلِمِينَ**﴾ [**الحجر: ٢**].

**١٠٦** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (صیڕاط لەسەر پشتی جەهەننەم دادەنرێ، دڕکێکی پێوەیە وەکو دڕکی ڕووەکی السعدان وایە، پاشان خەڵکی بەسەریدا دەڕۆن، جا تێیدایە ڕزگاری دەبێ و سەلامەت دەبێ، وە تێیدایە دەڕوشێت، وە تێیدایە دڕکەکە لێی گیر دەبێ و دەیخاتە ناو ئاگرەکەوە، جا کە الله تەواو بوو لە دادوەری لەسەر بەندەکان، ئیمانداران بیری پیاوانێك دەکەن کە لە دونیادا لەگەڵیان بوون، وەکو ئەوان نوێژیان دەکرد و زەکاتیان دەدا و ڕۆژوویان دەگرت و حەجیان دەکرد وە لەگەڵیاندا غەزایان دەکرد، بۆیە دەڵێن: پەروەردگارا؛ چەند بەندەیەك لە بەندەکانت لە دونیادا لەگەڵمان بوون، وەکو ئێمە نوێژیان دەکرد و زەکاتیان دەدا و ڕۆژوویان دەگرت و لەگەڵمان غەزایان دەکرد، نایانبینین؟).

فەرمووی: (اللە پێیان دەفەرموێ: بڕۆنە ناو ئاگر جا هەر کەستان تێیدا دۆزیەوە دەری بهێنن).

فەرمووی: (ئەوانیش دەیان بینن کە بە پێی کردەوەکانیان ئاگر گرتونی، تێیدایە کە ئاگر تا پێیەکانی گرتویەتی، وە تێیدایە ئاگر تا نیوەی قاچەکانی گرتویەتی، وە تێیدایە هەتاکو ئەژنۆکانی، وە تێیدایە هەتاکو کەمەری، وە تێیدایە هەتاکو سینگی، وە تێیدایە هەتاکو گەردنی گرتویەتی و ڕووخساری نەگرتۆتەوە) .

فەرمووی: (ئینجا دەریان دەهێنن و دەیان خەنە ناو ئاوی ژیانەوە), وترا: ئەی پێغەمبەری اللە ﷺ ئاوی ژیان چیە؟

فەرمووی: (غوسڵی ئەهلی بەهەشتە، جا دەڕوێن هەروەکو چۆن تۆو دەڕوێ کە هەڵگیراوە لە ناو قوڕ و پوشدا، پاشان پێغەمبەران شەفاعەت دەکەن بۆ هەر کەس کە بە نیەت پاکیەوە شاهێدی دابێت بە لا إله إلا الله، دواتر دەریان دەهێنن).

فەرمووی: (پاشان اللە ڕەحم دەکا بەوانەی کە تێیدان، بۆیە هیچ بەندەیەکی تێدا ناهێڵێتەوە کە مسقاڵە زەڕڕەیەك ئیمان لە دڵیدا بێت، ئیللا دەری دەهێنێ).

# دەروازەيەك دەربارەی ئيمان هێنان بە هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە



محمد وتی: وە ئەهلی سوننە باوەڕیان هەیە بە هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە.

الله ﷻ فەرموویەتی: ﴿يَوۡمَ يَأۡتِي بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفۡسًا إِيمَٰنُهَا﴾ **[الأنعام: ١٥٨]** .

١٠٧ - رسول الله ﷺ فەرمووی: (قيامەت بەرپا نابێت هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵنەيەت، كاتێكيش خەڵكی بينييان هەموويان ئيمان دەهێنن، ئەو ڕۆژە بريتيە لەو ڕۆژەی كە هيچ نەفسێك ئيمانەكەی سودی پێ ناگەيەنێت ئەگەر پێش ئەوە ئيمانی نەهێنابێت يان لە ئيمانەكەی خێر دەست نەكەوتبێت).

١٠٨ - رسول الله ﷺ فەرمووی: (دەرگای تەوبە كراوەيە لە ئاراستەی خۆرئاواوە) .

یان: (لە خۆرئاواوە دەرگای تەوبە کراوەیە، مەوداکەی پێنج سەد ساڵ ڕێیە، تا ئێستاش کراوەیە بۆ تەوبە، تاکو خۆر لە خۆرئاواوە هەڵنەهاتووە، جا کە هەڵهات دادەخرێت).

**١٠٩** - عبداللّٰه بن عمرو **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** فەرمووی: خۆر هەڵدێت لەو شوێنەوەی کە فەجر دادێت، جا کە ویستی هەڵبێت دوا دەکەوێت تاکو بەر کۆڵەکەکان دەکەوێ، و دەڵێ: پەروەردگارا من ئەگەر هەڵبێم ئەوا لە غەیری تۆ دەپەرسترێ، پاشان بەسەر نەوەکانی ئادەم دا هەڵدێت، جا بەردەوام دەبێ تا خۆرئاوابون دادێ، سەلام دەکات و وەڵام دەدرێتەوە و سوجدە دەبات و سەیر دەکرێ، پاشان داوای ئیزن دەکا و ئیزنی پێ دەدرێ، ئینجا دەڕوا بەرەو خۆرهەڵات، مانگیش بە هەمان شێوەیە، تاکو ڕۆژێکی بەسەردا دێت کە ئاوا دەبێت سەلام دەکات وەڵام نادرێتەوە وە سوجدە دەبات سەیر ناکرێ وە داوای ئیزن دەکات ئیزنی پێ نادرێ، پاشان پێیان دەوترێ: بگەڕێنەوە لەو شوێنەوەی کە لێیەوە هاتوون، ئەوانیش لە خۆرئاواوە دەردەکەون هەروەکو دوو حوشتری هاوتا، ئەوەش بریتیە لە فەرمایشتی: ﴿**يَوۡمَ يَأۡتِي بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ**﴾.

**١١٠** - ابن عباس **رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما** فەرمووی: ئەو شەوەی بۆ بەیانییەکەی خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت، درێژییەکەی هێندەی سێ شەوە.

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە دەرچوونی دەجال



محمد وتی: ئەهلی سوننە باوەڕیان هەیە بە دەرچوونی دەجال، الله ئێمە و تۆش بپارێزێ لە فیتنەکەی.

**١١١** - لە عبدالله بن عباس ەوە **رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما** كە رسول الله ﷺ فێری ئەم دوعایەی دەکردن وەکو چۆن فێری سورەتێکی لە قورئان دەکردن، دەڵێ: (اللهم من پەنات پێ دەگرم لە سزای دۆزەخ، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای ناوگۆڕ، وە پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی دەجال، وە پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی ژیان و مردن).

---

: عەرەبیەکەی: اللهم إني أعوذ بك من عذاب جهنم، وأعوذ بك من عذاب القبر، وأعوذ بك من فتنة المسيح الدَّجال، وأعوذ بك من فتنة المحيا والممات .

**١١٢** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (ئایا شتانێکتان بۆ باس بکەم دەربارەی دەجال کە هەرگیز هیچ پێغەمبەرێك پێش من باسی نەکردووە؟ ئەو کوێرە، وە ئەو هاوشێوەی بەهەشت و دۆزەخ لەگەڵیدا دێ، جا ئەوەیان کە دەڵێ: ئەوە بەهەشتە ئەوا دۆزەخە، ئەوەشیان کە دەڵێ: ئەوە دۆزەخە ئەوا بەهەشتە، وە من بەوە ئاگادارتان دەکەمەوە هەروەکو چۆن نوح گەلەکەی ئاگادار کردەوە).

**١١٣** - لە ابن عمر ـەوە **رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما** کە رسول الله ﷺ باسی مەسیحی دەجالی کرد لە ناو خەڵکیدا، فەرمووی: (الله کوێر نیە، بەڵام مەسیحی دەجال چاوی ڕاستی کوێرە، چاوی وەکو ترێی تەقیو وایە).

**١١٤** - پێغەمبەر ﷺ کاتێك خەڵکی ئاگادار دەکردەوە لە فیتنەی دەجال؛ پێی فەرموون: (کەس لە ئێوە پەروەردگاری نابینێ تا نەمرێ، وە ئەو لە ناوچاوانی نوسراوە کافر، هەموو کەسێک کە ڕقی لە کارەکەی بێت دەیخوێنێتەوە).

**١١٥** - عمر بن الخطاب **رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه** فەرمووی: بەرد باران کردن حەدێکە لە حەدەکانی الله، جا هەڵ نەخەڵەتێن دەربارەی، چونکە کەسانێك دێن بەرد باران کردن و دەجال و تەرازوو و حەوز و هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە وە شەفاعەت و دەرهێنانی کەسانێک لە ئاگر بە درۆ دەخەنەوە.

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە دابەزینی عیسا و كوشتنی دەجال



محمد وتی: وە ئەهلی سوننە باوەڕیان بە دابەزینی عیسی علیه السلام هەیە، لەگەڵ كوشتنی دەجال.

الله ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ﴾ [الزخرف: ٦١]، واتە: عیسی.

وە فەرموویەتی: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ﴾ [النساء: ١٥٩]، واتە: پێش وەفاتی عیسی.

**١١٦** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (پێغەمبەران برای یەكن لە باوكەوە، دایكیان جیایە و دینیان یەكە، وە من لە خەڵكی ئەولاترم بە عیسی بن مریم، لە نێوان من و ئەودا پێغەمبەر نیە، وە ئەو دادەبەزێ بە بێ گومان، كاتێك بینیتان بیناسنەوە، پیاوێكی مام ناوەندە، لە ناو دوو پۆشاكی المُمَصَّرَة دایە، بەرەو سور و سپیایی دەڕوات، قژی خاوە، سەری ئاوی لێدەتكێ تەڕیشی بەرنەكەوتووە، جا خاچ دەشكێنێ و بەراز دەكوژێ، وە جەنگ لەگەڵ خەڵكی دەكات لە پێناو

ئیسلامدا، الله لە سەردەمی ئەودا هەموو دینەکان لەناودەبات جگە لە ئیسلام، تا ئەوەی ئاسایش سەر زەوی دەگرێتەوە، تەنانەت وای لێدێ شێر لەگەڵ حوشتردا دەلەوەڕێ، وە پڵنگ لەگەڵ مانگادا، وە گورگ لەگەڵ مەڕدا، وە منداڵ یاری بە مار دەکات کەسیشیان زیان بەوی تر ناگەیەنن).

محمد وتی: پۆشاکی المُمَصَّرَة: ئەوەیە کە زەردییەکی کەمی تێدایە.

**١١٧** - دایکی ئیمانداران عائشة رضي الله عنها فەرمووی: رسول الله ﷺ هاتە لام و بینیمی کە دەگریم .

فەرمووی: (چی دەتگریێنێ؟) .

وتم: یا رسول الله ﷺ بیری دەجالم کەوتەوە .

فەرمووی: (مەگری، چونکە گەر دەربچێ و من زیندوو بم بەستانە، ئەگەریش وەفاتم کرد ئەوە پەروەردگارتان کوێر نیە، وە ئەو جولەکەکانی ئەصبەهان لەگەڵیدا دەردەچن، دەگەڕێ هەتا دێتە لایەکی مەدینە کە ئەو ڕۆژە حەوت دەرگای هەیە، لەسەر هەر دەرگایەك دوو فریشتە هەیە، جا ئەهلە خراپەکەی دەردەچنە دەرەوە، دەگەڕێ هەتا دەگاتە لُد، دواتر عیسى دادەبەزێ و دەیکوژێ، دواتر عیسى بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ یان نزیکەی ٤٠ ساڵ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە، وەکو پێشەوایەکی دادگەر و حاکمێکی دادپەروەر).

**١١٨** - وه باوكم بۆی باسكردم له علي له ابي داود له يحيى دەربارەی فەرمایشتی: ﴿**وَإِنَّهُۥ لَعِلۡمٌ لِّلسَّاعَةِ**﴾.

سعيد بۆی باسكردم له قتادة، وتی: واته دابەزینی عیسی: ﴿**فَلَا تَمۡتَرُنَّ بِهَا**﴾ واته: به قیامەت، گومانی لێ نەكەن.

**١١٩** - وتی: قتادة بۆی باسكردم دەربارەی فەرمایشتی: ﴿**وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ قَبۡلَ مَوۡتِهِۦ**﴾ وتی: پێش وەفاتی عیسی، كاتێك ئەم ئایەته دابەزی: ﴿**وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدًا**﴾ بەوەی كه ئەو پەیامەكانی پەروەردگاری گەیاند، و دانی نا به بەندایەتی لەسەر نەفسی خۆی.

# دەروازەیەك دەربارەی ئیمان هێنان بە قەدەر



محمد بن عبدالله وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە كە قەدەرەكان هەمووی خێر و شەڕی و شیرین و تاڵی؛ لە الله وەیە، ئەو دروستكراوەكانی دروستكرد و زانی چی دەكەن و بەرەو چی دەڕۆن، بۆیە هیچ ڕێگرێك نیە لەو شتەی دەیبەخشێ و هیچ بەخشەرێك نیە لەو شتەی ڕێگری لێ دەكا.

الله ﷻ كە ڕاستگۆترینی بێژەرانە فەرموویەتی: ﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ﴾ **[الأعراف: ٥٤]**.

وە فەرموویەتی: ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا﴾ **[الأحزاب: ٣٨]**.

وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ﴾ **[القمر: ٤٩]**.

وە فەرموویەتی: ﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا﴾ **[التوبة: ٥١]**.

وە فەرموویەتی: ﴿وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً﴾ **[الأنبياء: ٣٥]**.

وە فەرموویەتی: ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ﴾ **[الأنفال: ٢٤]**.

وه فەرموویەتی: ﴿**إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ**﴾ [**يونس: ٩٦**].

وه فەرموویەتی: ﴿**وَلَوۡ شِئۡنَا لَأٓتَيۡنَا كُلَّ نَفۡسٍ هُدَىٰهَا**﴾ [**السجدة: ١٣**].

وه فەرموویەتی: ﴿**إِن تَحۡرِصۡ عَلَىٰ هُدَىٰهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَن يُضِلُّۖ**﴾ [**النحل: ٣٧**].

وه هاوشێوەی ئەمانە لە قورئاندا زۆرە.

**١٢٠** - طاوس اليماني وتی: گەیشتم بە کەسانێك لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ دەیان فەرموو: هەموو شتێك بە قەدەرە.

طاوس وتی: وە گوێم لە عبدالله بن عمر بوو دەیفەرموو: رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (هەموو شتێك بە قەدەرە، تەنانەت بێ توانایي و چالاکیش)، یان: (چالاکی و بێ توانایي).

**١٢١** - عمرو بن العاص **رَضِيَ اللّهُ عَنْه** فەرمووی: کێ بانگەشەی ئەوە دەکات کە الله کردارێکی لەسەر تەقدیر کردووم و سزاشم دەدا لەسەری؟! أبي موسی الأشعري هەڵسایەوە بۆی و خەڵکەکەی تێپەڕاند تا دانیشت لەبەر دەمیدا فەرمووی: من بانگەشەی ئەوە دەکەم .

عمرو فەرمووی: إنا لله و إنا إلیه راجعون، خەریك بوو تیا بچم، ڕاستت کرد ئەی أبا موسی، جا کاتێك رسول الله ﷺ هاتە دەرەوە ئەمەی بۆ باس کرا،

رسول الله ﷺ فەرمووی: (کەستان ئیمانتان نیە تا ئیمان نەهێنن بە قەدەر، بە خێر و شەڕی، وشیرین و تاڵیەوە، وە بزانێت ئەوەی توشی بووە نەدەبوو توشی نەبێ، وە ئەوەی توشی نەبووە نەدەبوو توشی بێ).

**١٢٢** - عبدالرحمن بن قتادة السلمي **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** گوێی لە رسول الله ﷺ بووە دەیفەرموو: (الله ئادەمی درووست کرد، دواتر درووستکراوەنی لە پشتی گرت، فەرمووی: ئەمانە لە بەهەشتن و بەلاشمەوە گرنگ نیە، وە ئەمانەش لە دۆزەخن و بەلامەوە گرنگ نیە) .

قسەکەرێك وتی: یا رسول الله ﷺ، کەواتە لەسەر چی کردەوە بکەین؟

فەرمووی: (لەسەر نیشانەکانی قەدەر).

**١٢٣** - عبدالله بن عمرو بن العاص **رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما** فەرمووی: گوێم لە رسول الله ﷺ بوو دەیفەرموو: (الله قەدەری هەموو درووستکراوەکانی نووسی پەنجا هەزار ساڵ پێش درووستکردنی ئاسمانەکان و زەوی، وە عەرشەکەی لەسەر ئاوە).

**١٢٤** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (پیاو هەیە کردار دەکات بە کرداری ئەهلی بەهەشت لەوەی لە خەڵکی دیارە، کەچی لە ئەهلی ئاگرە، وە پیاو هەیە کردار دەکات بە کرداری ئەهلی ئاگر لەوەی لە خەڵکی دیارە، کەچی لە ئەهلی بەهەشتە).

---

: مەبەستی لە عاقیبەتی هەردوو کەسەکەیە واتە بۆ نمونە کەسێك لە سەرەتاوە باشە بەڵام عاقیبەت شەڕە بۆیە لە کۆتایی تەمەنیدا کرداری ئەهلی ئاگر دەکات وە بە پێچەوانەوە، اللە پەنامان بدا لە عاقیبەت شەڕی .

**١٢٥** - لە عبيد بن ابي طلحة المكي ەوە؛ كە أبا الطفيل البكري پێی ڕاگەیاندووە کە گوێی لە ابن مسعود **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** بووە دەیفەرموو: بەدبەخت ئەو کەسەیە کە لە سکی دایکیدا بەدبەخت بووە، وە کامەران ئەو کەسەیە کە بە جگە لەوە ئامۆژگاری کراوە، بۆیە وتم: ئەوەی کە هیچ کردەوەیەکی نەکردووە چۆن بەدبەخت دەبێ؟

دواتر گەیشتم بن حذيفة بن أسيد الغفاري و ئەوەی ابن مسعود فەرمووی پێیم ڕاگەیاند .

پێی وتم: گوێم لە رسول اللە ﷺ بوو دەیفەرموو: (اللە کە بیەوێ بەندە درووست بکات، فریشتەیەك دەڵێ: پەروەردگارا؛ کوڕ بێ یان کچ؟ پەروەردگاریش ئەوە دەفەرموێ کە دەیەوێ، فریشتەکەش دەینووسێ، دواتر فریشتەکە دەڵێ: پەروەردگارا؛ بەدبەخت بێ یان کامەران؟ پەروەردگاریش ئەوە دەفەرموێ کە دەیەوێ، ئەویش دەینووسێ، پاشان فریشتەکە دەڵێ: پەروەردگارا؛ ئەو بە چی دەگات؟ پەروەردگاریش ئەوە دەفەرموێ کە دەیەوێ، پاشان فریشتەکە دەڵێ:

ڕزقەکەی چی بێ؟ پەروەردگاریش ئەوە دەفەرموێ کە دەیەوێ، فریشتەکە دەینووسێ، پاشان دەڵێ: پەروەردگارا؛ ئەجەلەکەی چی بێ؟ پەروەردگاریش ئەوە دەفەرموێ کە دەیەوێ، فریشتەکەش دەینووسێ).

**١٢٦** - پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لە کۆتا زەماندا دەرگایەك لە بارەی قەدەرەوە دەکرێتەوە لەسەر ئوممەتەکەم، هیچ شتێکیش دایناخات، بەڵام بەستانە کە ئەمە بخوێنن: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ **[البقرة: ١٠٦]**، لەگەڵ فەرمایشتی: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّ ذَٰلِكَ فِى كِتَٰبٍ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ **[الحج: ٧٠]**).

**١٢٧** - لە رجاء بن سويد ەوە کە عيسى بن مريم عليه السلام لە پەروەردگاری پرسی، وتی: پەروەردگارا تۆ دادگەریت، وە بڕیاردانیشت دادپەروەرانەیە، کەواتە چۆن لەسەر بەندەیەك تاوان دەنووسی و دواتر سزای دەدەی لەسەری؟

فەرمووی: ئەی کوڕی ئافرەتە سەڵتەکە، واز لەوە بێنە، چونکە ئەوە لە عیلمە نهێنیەکەمە.

**١٢٨** - لە سفيان بن سعيد الثوري ەوە کە عوزەیر بە هەمان پرسیاری عیسى ى لە پەروەردگاری پرسی، فەرمووی: واز لەمە بێنە! ئەویش ئەمەی

چەندبارە کردەوە، پێی فەرموو: پرسیارت دەربارەی عیلمەکەم کرد، بۆیە سزای تۆ لای من ئەوەیە ناوت بسڕمەوە لە پێغەمبەرایەتی.

**١٢٩** - لە عمر بن محمد ەوە، وتی: پیاوێك گوێم لە سالم بن عبدالله بن عمر بوو کە پیاوێك پرسیاری لێکرد و وتی: زینا بە قەدەر دانراوە؟

وتی: بەڵێ.

وتی: هەموو شتێك الله نوسیویەتی لەسەرم؟

وتی: بەڵێ،

وتی: لەسەری نوسیوم و سزاشم دەدا لەسەری؟

سالم هەندێك بەردی هەڵگرت و تێیگرت.

**١٣٠** - ابن وهب وتی: انس بن عیاض بۆی باسکردم کە غیلان - یەکێکە لە سەرانی قەدەرییەکان - لەسەر ڕێگای ربیعة وەستاو وتی: ئەی ربیعة؛ تۆیت بانگەشەی ئەوە دەکەی کە الله پێی خۆشە سەرپێچی بکرێت؟

ربیعة وتی: هاوار بە حاڵت ئەی غیلان، کەواتە ئەوە تۆیت بانگشەی ئەوە دەکەی کە سەرپێچی الله دەکرێ بە زوڵم و زۆر؟

**١٣١** - عمر بن ذر وتی: گوێم لە عمر بن عبدالعزیز بوو دەیفەرموو: ئەگەر الله بیویستایە سەرپێچی نەکرێت ئیبلیسی درووست نەدەکرد.

**١٣٢** - سعيد بن بجير دەربارەی فەرمایشتی الله: ﴿**مَّآ أَصَابَكَ مِنۡ حَسَنَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفۡسِكَۚ**﴾ **[النساء: ٧٩]**

وتی: تاوانی تۆیە، وە من لەسەرتم تەقدیر کردووە.

**١٣٣** - أبا سليمان الداراني دەربارەی فەرمایشتی: ﴿**كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٖ**﴾ **[الرحمن: ٢٩]** .

دەیوت: لە تازە کردنەوە نیە، بەڵکو لە جێبەجێکردنی ئەوەیە کە تەقدیر کراوە لەو ڕۆژە، لە کاروباریدا هیچ شتێك دانایەت.

**١٣٤** - مالك وتی: هیچ شتێك نیە ڕوونتر بێت بۆ ڕەد دانەوەی ئەهلی قەدەر، لە فەرمایشتی الله: ﴿**وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا** (٣٠) **يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمَۢا** (٣١)﴾ **[الإنسان]** .

وە الله فەرموویەتی: ﴿**إِنۡ هِيَ إِلَّا فِتۡنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهۡدِي مَن تَشَآءُ**﴾ **[الأعراف: ١٥٥]** .

وە فەرموویەتی: ﴿**وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَۚ وَيَفۡعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ**﴾ **[إبراهيم: ٢٧]**.

وە فەرموویەتی: ﴿**لَتُفۡسِدُنَّ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَّتَيۡنِ وَلَتَعۡلُنَّ عُلُوّٗا كَبِيرٗا**﴾ **[الإسراء: ٤]**

مالك وتی: هاوشێوەی ئەمانە لە قورئاندا زۆرە.

# دەروازەیەك دەربارەی ئەوەی كە ئیمان وتە و كردەوەیە



محمد وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە كە ئیمان نیەت پاكیە بە دڵ بۆ الله، وە شاهێدی دان بە زمان، وە كردەوە بە ئەندامەكان، لەسەر نیەتێكی پاك و پێكانی سوننەت.

الله ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ﴾ [الحجرات: ١٥].

وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِۚ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ﴾ [التوبة: ١١١].

پاشان وەسفی کردوون بە کردوەکانیان، فەرموویەتی: ﴿ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلۡعَٰبِدُونَ ٱلۡحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ **[التوبة: ١١٢]**

وە فەرموویەتی: ﴿فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡۚ﴾ **[التوبة: ٥]** .

وە فەرموویەتی: ﴿إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥۚ﴾ **[فاطر: ١٠]**.

محمد وتی: وە ئیمان هێنان بە الله بە زمان و دڵە بەڕاستخەرەوەی ئەوانەش کردەوەیە، جا وتە و کردەوە ھاوتان، هیچیان جێگیر نین بە بێ ئەوی تریان.

**١٣٥** - لە القاسم بن عبدالرحمن ەوە؛ کە پیاوێك ھاتە لای أبي ذر **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه**، پێی وت: ئەی أبا ذر ئیمان چیە؟

ئەویش ئەمەی بەسەردا خوێندەوە: ﴿لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلۡكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلۡمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُوفُونَ بِعَهۡدِهِمۡ إِذَا عَٰهَدُواْۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ﴾ **[البقرة: ١٧٧]** .

پیاوەکەش وتی: دەربارەی چاکە پرسیارم لێ نەکردی .

أبو ذر فەرمووی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، پرسیاری لێکرد دەربارەی ئەوەی پرسیت، پێغەمبەریش ﷺ ئەمەی بەسەردا خوێندەوە کە من خوێندمەوە بەسەرتدا، ئەویش ڕازی نەبوو وەکو چۆن تۆ ڕازی نەبوویت.

**١٣٦** - أبو حيان وتی: گوێم لە الحسن البصري دەیوت: وتە بەبێ کردەوە ڕاناوەستێ، وە وتە و کردەوە سوودیان نابێ بە بێ نیەت، وە وتە و کردەوە و نیەت سوودیان نیە ئیللا بە سوننەت نەبێت.

**١٣٧** - داود بن أبي هند وتی: وتە ڕاناوەستێ بە بێ کردەوە، وە وتە و کردەوەش ڕاناوەستن ئیللا بە نیەت نەبێت، وە وتە و کردەوە و نیەت ڕاناوەستن ئیللا بە ڕێککەوتن لەگەڵ سوننەت نەبێت.

**١٣٨** - أسد وتی: يحيى بن سليم بۆی باسکردین وتی: پرسیارم کرد لە سفيان الثوري و هشام بن حسان دەربارەی ئیمان؟ وتیان: ئیمان وتە و کردەوەیە.

**١٣٩** - يحيى وتی: پرسیارم کرد لە ابن جريج دەربارەی؟ ئەویش هەمان شتی وت، وە گوێم لە مالك بن أنس بوو هەمان شتی دەوت.

# دەروازەیەك دەربارەی تەواویێتی ئیمان و زیاد بوون و كەم بوونی



محمد وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە كە ئیمان پلە و پێگەیە، تەواو دەبێ، و زیاد دەكات و كەم دەكات، ئەگەر ئەوە نەبوایە ئەوا، خەڵكی یەكسان دەبوون تیایدا وە ئەو كەسەی پێشكەوتووە فەزڵی نەدەبوو بەسەر ئەو كەسەی پێشی كەوتراوە.

وە بە ڕەحمەتی الله و بە تەواوێتی ئیمان ئیمانداران دەچنە بەهەشتەوە، وە بە زیادبوون و كەم بوون و كەمتەرخەمی تیایدا فەزڵیان دەبێ لە پلەكان: ﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ فَضَّلۡنَا بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ وَلَلۡأٓخِرَةُ أَكۡبَرُ دَرَجَٰتٖ وَأَكۡبَرُ تَفۡضِيلٗا﴾ [الإسراء: ٢١]، نمونەی ئەمانەش لە قورئاندا زۆرن.

**١٤٠** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (لە بەهەشتدا پلە لەسەروو پلەوەیە وەكو نێوان ئاسمان و زەوی، پیاو چاوی بەرز دەكاتەوە بروسكەیەك دەبینێ خەریكە بینایی ببات، جا لەوە دەتۆقێ، و دەڵێ: ئەمە چیە؟

پێی دەوترێ: ئەمە نوری فلان كەسی براتە .

دەڵێ: فڵانی برام؟! لە دونیادا بە یەکەوە کردەوەمان دەکرد، کەچی بەم شێوەیە فەزڵ دراوە بەسەرمەوە؟

پێی دەوترێ: ئەو کردوەی لە تۆ باشتر بوو، پاشان لە دڵیدا ڕەزامەندی دادەنرێ تا ڕازی دەبێت).

**١٤١** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (هەر کەس سەگێك ڕابگرێ جگە لە سەگی ناو ئاژەڵ و سەگی ڕاو، ئەوا هەموو ڕۆژێك دوو قیراط لە کردەوەکانی کەم دەبێتەوە).

**١٤٢** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (کەم بوونی دینی ئافرەتان سوڕی مانگانەیە).

**١٤٣** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (کامڵترین ئیماندار لە ئیمان ڕەوشت جوانترینیانە).

**١٤٤** - لە عمير بن حبيب ی هاوەڵی پێغەمبەرەوە ﷺ، فەرمووی: ئیمان زیاد و کەم دەکات .

وتیان: زیاد و کەم کردنی کامەیە؟

فەرمووی: ئەگەر یادی الله مان کرد و ڕۆژوومان گرت و نوێژمان کرد زیاد دەکات، وە ئەگەر بێ ئاگا بووین و هەڵەمان کرد کەم دەکات.

**١٤٥** - له أبي هريرة ـوه رضي الله عنه، دەيفەرموو: ئیمان زیاد دەكات و كەم دەكات.

**١٤٦** - ابن وهب وتی: ابن سمعان بۆی باسكردم كه عبدالله بن عبدالرحمن بن ابو حسین پێی ڕاگەیاندووه له شهر بن حوشب الاشعري ـەوە؛ كه رسول الله ﷺ ئەگەر هەڵبسایه له مەجلیسەكەی و تەواو بووا له گوتارەكەی، عبدالله بن رواحة جێی دەگرتەوه له مەجلیسەكەی، وه دەستی هاوەڵێكی و دوو هاوەڵی یان سێ هاوەڵی خۆی دەگرت، و دەیفەرموو: وەرن ئیمانمان زیاد بكەین، وەرن ساتێك ئیمان بهێنین، وەرن یادی پەروەردگارمان بكەینەوە به گوێڕایەڵی كردنی، بەڵكو یادمان بكاتەوە به ڕەحمەتەكەی.

**١٤٧** - رسول الله ﷺ دەرچوو و فەرمووی: (سێ شت له بنچینەی ئیمانن: دەست گرتنەوه لەو كەسەی كه دەڵێ لا إله إلا الله، به تاوان تەكفیری ناكەین و دەری ناكەین له ئیسلام به كردەوەیەك، جیهادیش دەمێنێ لەو كاتەوەی الله منی ناردووه تا كۆتا ئوممەتی من جەنگ لەگەڵ دەجالدا دەكات، ستەمی هیچ ستەمكارێك و دادگەری هیچ دادگەرێك بەتاڵی ناكاتەوه، وه ئیمان به هەموو قەدەرەكان).

**١٤٨** - الحسن وتی: رسول الله ﷺ فەرمووی: (ئیسلام لەسەر سێ شت دامەزراوه .....)، دواتر فەرموودەكەی باس كرد، وه تێیدا بوو: (دەستگرتنەوه

له ئەهلی لا إله إلا الله، به تاوانێك تەكفیریان مەكەن و شاهێدی شیریكیان لەسەر مەدەن).

**١٤٩** - أبو سفیان وتی: پیاوێك پرسیاری له جابر بن عبدالله رضي الله عنه كرد: ئایا ئێوه ناوی كەستان له ئەهلی قیبله دەنا كافر؟

فەرمووی: پەنا به الله!

وتی: ئەی ناوتان دەنا موشریك؟

فەرمووی: نەخێر.

**١٥٠** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (زانا و فەرموودەناسەكانتان مەخەنە بەهەشت و دۆزەخەوە، تا ئەو كاتە دێت كە الله ئەو كەسە دەبێ حوكم بكات له نێوانیان له ڕۆژی قیامەت).

**١٥١** - عبدالله بن مسعود **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** فەرمووی: ئێمە هیچ شتێكمان لەسەر هیچ پیاوێك نەدەوت، تا سەیرمان دەكرد لەسەر چ حاڵێك دەمرێت، ئەگەر كۆتایی پێ بهاتایه لەسەر خێر ئومێدمان دەكرد توشی خێر ببێت، ئەگەر لەسەر جگە لەوە كۆتایی پێ بهاتایه ترسمان لێی دەبوو.

**١٥٢** - ابن وضاح وتی: زهیر بن عباد پێی ڕاگەیاندم، وتی: هەموو ئەوانەی پێیان گەشتووم له شێخەكان: مالك بن أنس و سفیان بن عیینة و عیسى بن یونس و فضیل بن عیاض و عبدالله بن المبارك و وكیع بن جراح و جگە

لەوانیش، کەسیان تەکفیر نەدەکرد بە تاوان، وە شاهێدیان نەدەدا لەسەر کەس بەوەی لە بەهەشتە تەنانەت ئەگەر سەرپێچی الله ﷻ نەکردبێ، وە شاهێدی ئەوەیان لەسەر نەدەدا کە لە ئاگردایە، تەنانەت ئەگەر تاوانە گەورەکانیشی کردبێ، هەر کەس پێچەوانەی ئەمەی بکردایە ئەوە لایان موبتەدیع بووە.

ابن وضاح وتی: وە یونس بن عبدالأعلی پێی وتم: پابەند ببە بەمەوە و وازی لێمەهێنە.

وە حسین بن الحسن المروزي پێی وتم: بەڵێ ئەوە حەقە، کەس پێچەوانەی ناڵێت مەگەر زندیقێك نەبێت.

# دەروازەیەك دەربارەی داواكردنی لێخۆشبوون بۆ ئەهلی قیبلە، وە نوێژكردن لەسەر ئەو كەسەی دەمرێت لێیان



محمد وتی: وە ئەهلی سوننە داوای لێخۆشبوون داناپۆشن لە هیچ كەسێك لە ئەهلی قیبلە، وە وای نابینن واز لە نوێژ بهێنرێت لەسەر هەر كەسێك كە دەمرێت لێیان، تەنانەت ئەگەر لە ئەهلی زیادەڕۆییش بێت لەسەر خۆی.

الله بە پێغەمبەرەكەی ﷺ فەرموو: ﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ﴾ [محمد: ١٩] .

﴿وَصَلِّ عَلَيۡهِمۡۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٞ لَّهُمۡۗ﴾ [التوبة: ١٠٣].

**١٥٣** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (هەر كەس دوعای كرد بۆ پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار، الله بۆی دەگەڕێنێتەوە بە هەمان شت كە دوعای پێ كردووە، بۆ ئەو كەسانەی ڕۆشتوون و ئەوانەش كە ماونەتەوە).

**١٥٤** - زهير بن عباد وتی: هەموو ئەوانەی پێیان گەشتووم لە شێخەکان وایان دەبینی کە واز لە نوێژ ناهێنرێت لەسەر هیچ کەس لە ئەهلی قیبلە، ئەگەر چی هەموو کردەوەیەکیشی کردبێ.

: واتە هەموو تاوانێك، جگە لە شیرك و كوفری گەورە .

**١٥٥** - عبدالملك وتی: سوننەت ئەوەیە نوێژ بکرێ لەسەر هەموو ئەوانەی الله یان بە تاك ڕاگرتووە، ئەگەر چی زیادەڕۆش بێت لەسەر خۆی بە تاوان تەنانەت ئەگەر تاوانە گەورەکانیش بێ، مادام دەستی گرتووە بە تەوحید و دان بنێت بەوەی لەلایەن الله وە هاتووە، ئەوا نوێژی لەسەر دەکرێت، تاوانەکەشی لەسەر خۆیەتی و لێپرسینەوەی لەسەر پەروەردگارێتی، لای ئێمە ئیمانداره بەو تاوانانەشەوە؛ ئەگەر الله بیەوێ سزای دەدات، وە ئەگەر بیەوێ لێی خۆش دەبێت، دەری ناکەین لە ئیسلام بە تاوانەکان، وە ئاگری بۆ واجب ناکرێ بەوانە، تا الله ئەو کەسە دەبێ کە بڕیاری لە بارەوە دەدا بە عیلمەکەی خۆی، و دەیبات بۆ ئەو شوێنەی دەیەوێ لە بەهەشت یان ئاگر، تەنها ئەوە نەبێ کە ئێمە ئومێدمان هەیە بۆ کەسی چاکەکار و دەترسین لە کەسی خراپەکاری تاوانبار، بەمە دینداری بۆ الله دەکەین، وە بەمە ئامۆژگاری هەر کەس دەکەین کە

چاومان لێ دەكات، و ڕێنمونیمان وەردەگرێت، ئەمەش ئەوەیە كە ئەهلی سوننە و زۆرینەی ئەم ئوممەتە لەسەری بوون.

عبدالملك وتی: فەرموودەكەی عبدالله بن عمر: (كاتێك گەشتن بە مەی خۆرەكان سەلامیان لێ مەكەن، وە كاتێك نەخۆش كەوتن سەردانیان مەكەن، وە كاتێك مردن ئامادە مەبن لەسەریان).

واتاكەی بریتیە لەوەی: ئەمە وەردەگرین بۆ پیاوێك لە شتێك تایبەت بە نەفسی خۆی، واتای ئەوە نیە: واز لە نوێژكردن بهێنرێت لەسەریان لە ئەصڵدا.

**١٥٦** - محمد بن أحمد العتبي وتی: پرسیار لە سحنون كرا دەربارەی وتەی مالك لەسەر ئەهلی بیدەع (ئیباضی و قەدەریەكان و هەموو ئەهلی ئارەزووەكان)، ئایا نوێژیان لەسەر ناكرێت؟

وتی: ئەمەی بۆ ئەدەب دادان وت، وە ئێمەش لەو ڕووەوە ئەوە دەڵێینەوە، بەڵام كاتێك وەستێنران و كەس نەبوو نوێژیان لەسەر بكات، وای دەبینم وازیان لێ نەهێنرێ بە بێ نوێژ.

پێی وترا: ئەوانەی ئیمام كوشتونی لە ئەهلی ئارەزووەكان كاتێك جیابوونەتەوە لە كۆمەڵی موسڵمانان و بانگەوازیان بۆ ئەوە كرد كە لەسەرین، وە جەنگیان ڕاگەیاند، ئایا نوێژ دەكرێت لەسەریان؟

وتی: بەڵێ، ئەوان لە موسڵمانانن، بە هۆی ئەو تاوانانەیانەوە کە کوشتنی لەسەریان واجب کردووە وازیان لێناهێنرێ بۆ نوێژکردن.

جا پێی وترا: ئەی وتەکە چیە دەربارەی دووبارە کردنەوەی نوێژ لە دوای ئەهلی بیدەع؟

وتی: نوێژ دووبارە ناکرێتەوە لەو کات و لە دواییش، أشهب و المغیرة و جگە لەوانیش لە هاوەڵانی مالك وایان دەوت، وە ئەو کەسەی دەیوت نوێژ دووبارە دەکرێتەوە لە دوایان لەو کاتەدا یان لە دواییدا؛ دایبەزاند بۆ جێگەی نەصرانیەك، وە چووە سەر قیاسی وتەی ئیباضي و حروریەکان، ئەوانەی کە هەموو موسڵمانان تەکفیر دەکەن بە وتەی تاوان.

# دەروازەیەك دەربارەی ئەو فەرموودانەی نەفی ئیمانی تێدایە بە تاوانەكان



محمد وتی: فەرموودەكان لەم دەروازەیەدا زۆرن، وە لەوانەیە شتێكت بۆ باس بكەم كە واتاكانیان لەسەر دژەكەی بەڵگەی پێ دەهێنرێتەوە لەو شتانەی كە باسم نەكردووە، وە بە گۆڕینی لێكدانەوەكەی، خەواریج خەڵكیان تەكفیر كرد بە تاوانە بچوك و گەورەكان، لەوانە:

**١٥٧** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (زیناكار لەو كاتەی زینا دەكات ئیماندار نیە، وە دز لەو كاتەی دزی دەكات ئیماندار نیە، وە مەی خۆر لەو كاتەی مەی دەخواتەوە ئیماندار نیە، وە ماڵ و سامانێك بە ئاشكرا و بە زۆر ببات كە چاوی خەڵكی لەسەریەتی ئەوا ئیماندار نیە).

**١٥٨** - أنس **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** فەرمووی: رسول الله ﷺ وتاری بۆ خەڵكی نەدەدا ئیللا دەیفەرموو: (ئەو كەسە ئیمانی نیە كە ئەمانەتپارێزی نەبێت).

**١٥٩** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (ئەو كەسە ئیماندار نیە كە دراوسێكەی ئەمین نەبێت لە شەڕی).

١٦٠ - رسول الله ﷺ فەرمووی: (ئیماندار لەعنەتکار و تانەدەر و فاحیشەکار و زمان پیس نیە).

١٦١ - رسول الله ﷺ فەرمووی: (پیاوێك كە ئیمانی بە الله و ڕۆژی دوایی هەبێ ڕقی لە پشتیوانان نیە).

١٦٢ - لە صفوان بن سلیم ەوە، وتی: بە رسول الله ﷺ وترا: ئیماندار درۆزن دەبێت؟

فەرمووی: (نەخێر).

محمد وتی: جا ئەم كردەوە زەمكراوانەی ئەم فەرموودانە ئیمان لا نادەن، و كوفر واجب ناكەن، وە هەندێك لە زانایان وتویانە: واتاكەی بریتیە لە توندیەتی، تاكو خەڵكی لەو كردەوانەی هاتووە لەم فەرموودانە بە گەورەیان بزانن كە نەفی ئیمان دەكەن و لێیان دوور بكەونەوە.

هەندێكی تر وتیان: مەبەست لێی: حەقیقەت و ئیخلاص لە ئیمان نەفی دەكەن، چونكە ئیمانی كەسێك كە ئەو سەرپێچیانە بكات خاوەنی ئیمانی حەقیقی پاڵفتە نیە، وەكو ئیمانی ئەو كەسەی كە نایانكات، ئەهلی ئیمان نیشانە گەلێكیان هەیە كە پێوەی دەناسرێنەوە، لەگەڵ مەرج گەلێك كە پابەند كراون پێوەی، قورئان و ئاثارەكان بەوانە دێنە گۆ، بۆیە كە سەیری ئەو كەسە كرا كە ئیمانەكەی تێكەڵ بەو سەرپێچیانە كردووە؛ ئەوا دەوترێ: ئەمە لەوانە

نيه كه ئه‌هلی ئیمانی پێ وه‌سف كراوه، جا ئه‌و كات حه‌قیقه‌ت و ته‌واوێتی ئیمانی لێ نه‌فی ده‌كرێت، ئه‌م لێكدانه‌وه‌یه‌ش زیاتر له‌وه‌ ده‌چێ، والله أعلم.

**١٦٣** - وه ئه‌وه‌ی به ڕاستی ده‌خاته‌وه لای من وته‌كه‌ی عمر ﻫ رضي الله عنه: هیچ به‌نده‌یه‌ك ناگاته حه‌قیقه‌تی ئیمان تاكو واز له مشتومڕ نه‌مێنێ له كاتێكدا له‌سه‌ر حه‌قیشه، له‌گه‌ڵ درۆ له گاڵته‌كردندا.

ئه‌مه وهب بۆی باسكردم له ابن وضاح، له الصمادحي له ابن مهدي له سفيان له حبيب بن ابي ثابت له ميمون بن ابي شبيب، وتی: عمر فه‌رمووی: هیچ به‌نده‌یه‌ك ناگات . . . تا كۆتایی فه‌رمووده‌كه

**١٦٤** - هه‌روه‌ها هاوشێوه‌ی ئه‌وه: وته‌كه‌ی عبدالله بن عمرو ﻫ رضي الله عنهما: هیچ به‌نده‌یه‌ك هه‌موو ئیمان نامێنێ، تاكو جگه له پاك هیچ خواردنێك نه‌خوا، وه ده‌ستنوێژ به ته‌واوه‌تی هه‌ڵبگرێ له ناڕه‌حه‌تیه‌كاندا، وه واز له درۆ بهێنێت ئه‌گه‌ر چی به گاڵته‌شه‌وه بێت.

ئه‌مه إسحاق بۆی باسكردم له أسلم له يونس له ابن وهب له ابراهيم بن نشيط له قيس بن رافع له عبدالرحمن بن جبير له عبدالله بن عمرو بن العاص.

# دەروازەیەك دەربارەی ئەو فەرموودانەی کە تێیائدا باسی شیرك و كوفر كراوە



**١٦٥** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (دوای من کافر نەبنەوە، هەندێکتان بدەن لە گەردنی هەندێکی ترتان).

**١٦٦** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (جوێندان بە موسڵمان فیسقە، جەنگ کردن لەگەڵیدا کوفرە).

**١٦٧** - سعد بن عبیدة وتی: لای ابن عمر بووم **رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما**، پیاوێك سوێندی بە کەعبە خوارد، ابن عمر پێی فەرموو: هاوار بە حاڵت! وا مەکە، چونکە من گوێم لە رسول الله ﷺ بوو دەیفەرموو: (هەرکەس سوێندی بە غەیری الله خوارد، ئەوە شیرکی ئەنجام داوە یان کوفری ئەنجام داوە).

**١٦٨** – پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (هەرکەس بچێتە لای ئافرەتێك کە لە سوڕی مانگانەدایە، یان بچێتە لای ئافرەتێك لە دواوە، یان بچێتە لای کاهینێك و ئەوەی کە دەیڵێ بە ڕاستی دابنێ، ئەوا کافر بووە بەوەی دابەزیوە بۆ سەر محمد).

١٦٩ - له رجاء بن حيوة كه محمود بن ربيعة پێی ڕاگەیاندووە کە گوێی له شداد بن أوس **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** بووه، پاشان فەرموویەتی: ئیسلام دوور ناکەوێتەوە لە ئەهلەکەی، پێم وت: ئەی بە چی تۆمەتبار دەکرێن؟

فەرمووی: شیرك و شەهوەتێکی ڕاستەقینە .

وتم: ئایا ترسی شیرکت لەسەریان هەیە لە کاتێکدا الله یان ناسیوه؟

دەستی کوتا بە سنگی خۆیدا و فەرمووی: دایکت ڕۆڵە ڕۆڵەت بۆ بکات، تۆ هیچ بە شیرك دانانێی جگە لە دانانی خوایەك لە غەیری الله؟!

محمد وتی: جا ئەم فەرموودانە و هاوشێوەکانیان، واتاکانیان بریتیە لەوەی ئەم کردەوە باسکراونە لە ئەخلاق و ڕێبازی کافران و موشریکەکانە، نەهی لێ کراون تاکو موسڵمانان لێیان بە دوور بن.

بەڵام سەبارەت بەوەی کە هەر کەسێك شتێکی لەم کردەوانە کرد ببێتە موشریك بە الله؛ ئەوا نەخێر،ئەوەی دەلالەتت دەکا بۆ ئەمە بریتیە لە:

١٧٠ - فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ : (شیرك شاراوەترە لە ڕۆیشتنی مێرووله لەسەر بەرد) .

أبوبکر الصدیق رضي الله عنه فەرمووی: إنا لله وإنا إلیه راجعون .

رسول الله ﷺ پێی فەرموو: (شتێکت فێر نەکەم کە وتت پاك ببیتەوە لە شیرك؟) .

فەرمووی: بەڵێ یا رسول الله ﷺ .

فەرمووی: (بڵێ: اللهم پەنات پێ دەگرم کە شەریکت بۆ بڕیار بدەم و خۆشم بیزانم، وە داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم بۆ ئەوەی کە نایزانم).

ئەمە إسحاق بۆی باسکردم لە أسلم لە یونس لە ابن وهب، وتی: ابن أنعم پێی ڕاگەیاندم؛ کە رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (شیرك شاراوەترە لە ڕۆیشتنی مێروولە ...) وە فەرموودەکەی باس کرد.

بەڕاستخەرەوەی ئەمە بریتیە لە: فەرمایشتی الله ﷻ دەربارەی ئادەم و حەوا: ﴿فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا﴾: منداڵێکی کوڕ ﴿جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَآ﴾، لەبەر ئەوەی ناویان نا عبدالحارث.

---

: ئایەتەکە دەربارەی ئادەم و حەوا دابەزی علیهما السلام، الله فەرمووی کاتێك منداڵێکی کوڕی ساڵحمان پێیان بەخشی هاوبەشیان بۆ بڕیارداین، چونکە ناویان نا عبدالحارث واتە بەندەی حارث، هەڵبەتە بەمەش کافر نەبوون چونکە ئەمە کوفری بچوکە .

جا زانیمان جۆرێکی تر لە شیرك هەیە جگە لە شیرکی ئەو کەسەی کە خوایەکی تر دادەنێ جگە لەو، لەوانەش فەرمایشتی الله یە: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾، ابن عباس رضي الله عنهما بە کەسێك کە پرسیاری دەربارەی ئەمە لێکرد فەرمووی: ئەو کوفرە نیە کە لە میللەت دەری بکات.

محمد وتی: هەروەها لە کوفرەکان: لەوانەی لە فەرموودەکاندا هاتوون، کە ماناکانیان دەبێتە کوفری نیعمەت، لەوانە:

**١٧١** - فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئافرەتان کاتێك باسی دۆزەخی کرد، فەرمووی: (بینیم زۆربەی ئەهلەکەی ئافرەت بوون) .

وتیان: بە چی یا رسول الله؟

فەرمووی: (بە کوفرەکانیان) .

وتیان: کوفر دەکەن بە الله؟

فەرمووی: (کوفرانەی هاوسەرەکانیان دەکەن، وە کوفرانەی چاکەکان دەکەن، ئەگەر تەمەنێك لەگەڵ یەکێکیان باش بیت، پاشان شتێکت لێ ببینێت، دەڵێت: هەرگیز خێرم لە تۆ نەبینیوە).

سعید ئەمەی بۆ باسکردم لە العلاء لە ابن بکیر، وتی: مالك بۆی باسکردین لە زید بن أسلم لە عطاء بن یسار لە ابن عباس ـەوە رضي الله عنهما.

پاشان فەرموودەکەی دەربارەی خۆرگیران لە سەردەمی رسول الله ﷺ باسکرد، وە لە کۆتاییەکەیدا ئەوە هەبوو کە باسی کرد دەربارەی ئافرەتان.

**١٧٢** - وە لەوانەش: فەرمایشتی ﷺ : (الله بەیانی بە کەسانێك دەکاتەوە لەسەر نیعمەت، یان ئێوارەیان لەسەر نیعمەت پێ دەکاتەوە، پاشان کەسانێك پێی کافر دەبن، دەڵێن: بارانمان بۆ باری بە هۆی ئەو ئەستێرە و ئەم ئەستێرەیەوە).

إسحاق ئەمەی بۆ باسکردم، لە اسلم لە یونس لە ابن وهب، وتی: سفیان بن عیینة بۆی باسکردین لە پیاوێك کە بۆی باسکردووە لە محمد بن ابراهیم بن الحارث السلمي لە ابي سلمة بن عبدالرحمن لە ابو هريرة رضي الله عنه لە رسول الله وە ﷺ کە فەرموویەتی: (الله تعالى . . . ) پاشان فەرموودەکەی باسکرد.

# دەروازەیەك دەربارەی ئەو فەرموودانەی باسی نیفاقیان تێدا كراوە



**١٧٣** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (چوار شت هەیە هەر كەس تێیدا بێت مونافیقێكی پاڵفتەیە، وە هەر كەسیش خەسڵەتێك لەوانەی تێدا بێت ئەوە خەسڵەتێكی لە نیفاق تێدایە تاكو وازی لێ دەهێنێت: كاتێك قسەی گێڕایەوە درۆ بكات، كاتێك بەڵێنی دا نەیباتە سەر، كاتێك پەیمانی بەست غەدر بكات، وە كاتێك مشتومڕی كرد تاوان بكات).

**١٧٤** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (سێ شت هەیە هەر كەس تێیدا بێت مونافیقە، تەنانەت ئەگەر نوێژ بكات و ڕۆژوو بگرێت و بانگەشەی ئەوەش بكات ئیمانداره: كاتێك قسەی گێڕایەوە درۆ بكات، كاتێك بەڵێی دا نەیباتە سەر، وە كاتێك ئەمانەتی لا دانرا خیانەت بكات).

**١٧٥** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (نەرم و نیانی و شەرم لە ئیمانەوەیە، وە فاحیشە و زمان پیسی لە نیفاقەوەیە).

**١٧٦** - غريب الهمداني وتی: به ابن عمر ﻡ وت: ئێمه کاتێك دەچووینه لای کاربەدەستان وەسفمان دەکردن به شتانێك که تێیاندا نین، کاتێکیش دەردەچووین لایان دوعامان له الله لێیان دەکرد، فەرمووی: ئێمه ئەوەمان به نیفاق هەژمار دەکرد.

**١٧٧** - ابن مسعود **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** فەرموویەتی: گۆرانی نیفاق له دڵدا دەڕوێنێت، وەکو چۆن ئاو ڕووەك دەڕوێنێت.

محمد وتی: وه نیفاق زاراوەیەکی ئیسلامییه عەرەب پێش ئیسلام نەیانزانیوه، که وەرگیراوه له (نافق اليربوع - اليربوع جۆرێکه له مشك، ئەم ڕستەیەش واته ئەو کونەی ئەو مشکه هەڵیکەندووه - ) ەوه، که کونێکه له کونەکانی، لێی دەردەچێت کاتێك ئەو کونەی لێ گیرا که لێوەی چووەته ژوورەوه، بۆیه دەوترێ: نیفاقی کرد، ئەو مونافیقه، به لەفز دێته ناو ئیسلامەوه بەڵام به عەقد لێی دەردەچێ، له کاری مشك دەچێت، چونکه له دەرگایەك دێته ژوورەوه و له دەرگایەکی تر دەڕواتە دەرەوه.

جا لەو فەرموودانەی که تێیاندا باسی نیفاق کراوه و واتاکەشی ئەوه نەبێ که هەر کەس شتێك لەوانەی باسکراوه تێیاندا ئەنجام بدات ئەوا مونافیق بێت، وەکو نیفاقی ئەو کەسەی ئیسلام دەردەخا و کوفر دەشارێتەوه، ئەوا واتاکەی بریتیه لەوەی: که ئەم کردەوه و ئەخلاقانه له ئەخلاق و تەبیعەت و شەڕائیعی مونافیقانه، ئەمه و هاوشێوەکانی.

ئەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەمە:

١٧٨ - پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، وتی: یا رسول الله ﷺ من دوێنێ: ﴿بَرَآءَةٌ﴾ م خوێندەوە - واتە سورەتی التوبة - ، جا ترسام کە نیفاقم ئەنجام دابێت! فەرمووی: (ئایا شاهێدی دەدەی بەوەی کە هیچ پەرستراوێك نیە شایەنی پەرستن بێ جگە لە الله، و من نێردراوی الله م؟) .

وتی: بەڵێ .

فەرمووی: (بەمە لەگەڵ خۆت قسە دەکەیت؟) .

فەرمووی: نەخێر .

فەرمووی: (تۆ ئیمانداریت).

باوکم ئەمەی بۆ باسکردم لە علي لە يحيى بن محمد بن يحيى بن سلام، لە باپیریەوە: يحيى، وتی: عبدالرحمن بن یزید ئەمەی بۆ باسکردم لە القاسم بن ابي عبدالرحمن لە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ .... هەموو فەرموودەکەی باس کرد.

# دەروازەیەك دەربارەی ئەو فەرموودانەی كە باسی بەڕائەتیان تێدا كراوە



**١٧٩** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (هەر كەس چەكمان لەسەر هەڵبگرێ، لە من نیە).

**١٨٠** - رسول الله ﷺ دەیفەرموو: (هەر كەس دەست بەسەر شتێكدا بگرێ بە ستەم، لە ئێمە نیە).

**١٨١** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (هەر كەس گزیمان لێ بكات لە ئێمە نیە).

**١٨٢** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (كەسێك لە ئێمە نیە كە سوێند بە عیبادەتەكان بخوات، وە كەسێك خێزانی یان كۆیلەكەی پیاوێك لێ تێكبدا و هەڵی بگەڕێنێتەوە، جا ئەوە لە ئێمە نیە).

محمد وتی: لە زانایان هەن دەڵێ: واتای ئەم فەرموودانە بریتیە لە: (وەكو ئێمە نیە).

هەندێکی تریان دەڵێن: واتاکەی ئەوەیە کە هەر کەس ئەم کارانەی ئەنجام دا ئەوە لە گوێڕایەڵانمان نیە، وە لە چاولێکەرانمان نیە، وە لە پارێزەری شەڕائیعەکانمان نیە، ئەم وەسفانە و هاوشێوەکانیان.

بەڵام کە مەبەست لێی بریتی بێت: لە بەری بوون لەو کەسەی ئەنجامی دەدات بەو شێوەیە کە بەری دەبی لە کەسێکی غەیری میللەتی ئیسلام، ئەوا نەخێر.

**١٨٣** - محمد وتی: بەڵگەش لەسەر درووستێتی ئەم لێکدانەوەیە، والله اعلم بریتیە لە فەرمایشتی ﷺ: (ئەو کەسە لە ئێمە نیە کە لە سمێڵی ناگرێت).

ئەمەش اسحاق بۆی باسکردم لە احمش بن خالد لە ابن وضاح لە ابو بکر بن ابو شیبة ، وتی: عبدة بن سلیمان لە یوسف بن صهیب لە حبیب بن یسار لە زید بن ارقم، وتی رسول الله ﷺ فەرمووی ... پاشان باسی کرد

جا ئایا بۆ کەس دروستە کە لێکی بداتەوە بەوەی رسول الله ﷺ بەریە لە کەسێك کە لە سمێڵی نەگرێ؟

# دەروازەیەك دەربارەی ئەو فەرموودانەی كە تاوانێك چوێنراوە بە شتانێك لە خۆی گەورەتر، یان هاوتا كراوە



١٨٤ - ابن مسعود رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه فەرمووی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێكرد دەربارەی تاوانە گەورەكان؟

فەرمووی: (هاوبەش بۆ الله بڕیار بدەیت لە كاتێكدا ئەو دروستی كردووە، وە منداڵەكەت بكوژیت لە ترسی ئەوەی نانت لەگەڵدا دەخوات، وە زینا بكەیت لەگەڵ هاوسەری دراوسێكەت) .

دواتر ئەمەی خوێندەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا﴾ [الفرقان: ٦٨].

١٨٥ - خریم بن فاتك رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه فەرمووی: رسول الله ﷺ نوێژی بۆ كردین، كاتێك لێبووەوە، هەستا فەرمووی: (شاهێدی درۆ یەكسان كراوە

هاوبەش دانان بۆ الله) سێ جار وای فەرموو، دواتر ئەمەی خوێندەوە: ﴿حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ﴾ [الحج: ٣١].

**١٨٦** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (هەر کەس بە ئاڵوودەیی بە مەیەوە مرد، ئەوا وەکو بت پەرستێك مردووە).

واتای ئاڵوودە بوونیش لای ئەهلی عیلم ئەوەیە کە ئەوەی دەیخواتەوە باوەڕی بە بەردەوام بوون هەبێ تێیدا، تەنانەت ئەگەر لە ساڵێکیشدا تەنها یەك جار بیخواتەوە ئەگەر نیەتی گەڕانەوەی بۆی هەبێت ئەوا ئاڵوودە بووە.

محمد وتی: وە ئەوەی هەبێ لەم جۆرە لە فەرموودەکان کە تاوانێك بە گەورەتر لە خۆی چوێنراوە یان هاوتا کراوە، واتای ئەوەیە کە هەر کەس شتێك لەو تاوانانەی کرد، ئەوا گەیشتۆتەوە بەو کەسەی کە پێی چوێنراوە، لە پابەندێتی ناوی تاوانەکە پێی، تەنها ئەوە نەبێ کە هەر یەکێك لەوان لە تاوان بە ئەندازەی تاوانەکەی خۆیەتی.

وە بە تەحریفی ئەهلی لادان و ئارەزووەکان، کە واتاکانیان بۆ ئەم فەرموودانەی دامناوە لەم دەروازەیە و ئەو چوار دەروازەیەی پێشوو؛ گومڕاکەرە، وە تەفسیرکردنیان بە ڕای خۆیانە، نەفی ئیمانیان کرد بۆ ئەهلی تاوانەکان لە ئیمانداران و تەکفیریان کردن، وە داوای لێخۆش بوونیان لێ داپۆشین، وە دۆستایەتیان ناکەن، بەڵام ئێمە داوای لێ بوورین لە الله دەکەین

لەوەی پێی تاقیکردوونەتەوە، وە داوای پاراستن و جێگیری لەسەر گوێڕایەڵی و تەوفیق بۆ ڕەزامەندیەکەی لێ دەکەین.

# دەروازەیەك دەربارەی بەڵێن و هەڕەشە



محمد وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە کە بەڵێن فەزڵ و نیعمەتی الله یە، وە هەڕەشەش دادگەری و حەقی ئەوە، وە ئەو بەهەشتی کردووە بە شوێنی گوێڕایەڵان بە بێ جیاکاری، وە دۆزەخی کردووە بە شوێنی کافران بە بێ جیاکاری، وە بۆ ویستی خۆی ئەو ئیمانداره سەرپێچیکارانەی کە دەیەوێ دوایخستوون، جا الله حوکم دەکات و کەسیش نیە حوکمەکەی دوا بخات، وە لە کارەکانی ناپرسرێتەوە.

الله دەربارەی ئەو بەڵێنەی داویەتی بە ئیمانداره گوێڕایەڵەکان فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٍ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ [النساء: ١٣].

وە دەربارەی سەرپێچیکار و کافران فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدۡخِلۡهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ [النساء: ١٤].

وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوۡفَ نُصۡلِيهِمۡ نَارٗا كُلَّمَا نَضِجَتۡ جُلُودُهُم بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمٗا (٥٦)

وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَنُدۡخِلُهُمۡ ظِلّٗا ظَلِيلًا (٥٧)﴾ [النساء].

وه فه‌رموویه‌تی: ﴿وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيۡطَٰنَ وَلِيّٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدۡ خَسِرَ خُسۡرَانٗا مُّبِينٗا (١١٩) يَعِدُهُمۡ وَيُمَنِّيهِمۡۖ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا (١٢٠) أُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنۡهَا مَحِيصٗا (١٢١) وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلٗا (١٢٢)﴾ [النساء].

وه ده‌رباره‌ی ئه‌و ئیماندارانه‌ی كه بۆ ویستی خۆی دوای خستوون فه‌رموویه‌تی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ﴾ [النساء: ١١٦].

وه فه‌رموویه‌تی: ﴿رَّبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِكُمۡۖ إِن يَشَأۡ يَرۡحَمۡكُمۡ أَوۡ إِن يَشَأۡ يُعَذِّبۡكُمۡۚ﴾ [الإسراء: ٥٤].

جا به‌ڵێنی الله ﷻ بۆ ئیماندارانی گوێڕایه‌ڵ ڕاسته، وه هه‌ڕه‌شه‌ی له كافران و موشریكه‌كانیش ڕاسته، به‌ڵام هه‌ر كه‌س مرد له ئیمانداران كه پێداگر بووبێت له‌سه‌ر تاوانه‌كه‌ی، ئه‌وه له ژێر ویستیدایه، كه‌س بۆی نیه قسه بكات له‌سه‌ر الله له عیلمه غه‌یبه‌كه‌یدا، وه به نكۆڵی كردن له بڕیاره‌كانی، جا بڵێت: په‌روه‌ردگارت ڕه‌تی كردووه له كه‌سانی پێداگر له‌سه‌ر تاوان خۆش بێت وه‌كو

چۆن ڕەتی کردەوە سزای کەسانی تەوبەکار بدات، ﴿مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٌ﴾ [النور: ١٦].

**١٨٧** - عبادة **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** فەرمووی: بەیعەتمان دا بە رسول الله ﷺ، فەرمووی: (بەیعەتم پێ بدەن لەسەر ئەوەی هیچ شتێك نەكەن بە هاوبەش بۆ الله، وە دزی و زینا نەکەن، هەر کەسێکتان بە ئەمەك بێت ئەوە پاداشتەکەی لەسەر الله یە، وە هەر کەس شتێکی لەوانە توش بێ و سزا بدرێ، ئەوە کەفارەتەکەیەتی، بەڵام هەر کەس شتێکی لەوانە توش بێ و الله داپپۆشێ، ئەوە دەگەڕێنرێتەوە بۆ الله، ئەگەر ویستی سزای دەدات، وە ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێ).

**١٨٨** - رسول الله ﷺ دەیفەرموو: (الله پێنج نوێژی لەسەر بەندەکان نوسیوە، هەر کەس بەوانەوە هاتبێ، هیچ شتێکیانی لێ بە فیڕۆ نەدابێ، دێت و لای الله پەیمانێکی هەیە کە بیخاتە بەهەشتەوە، هەر کەسیش لە حەقیانی کەم کردەوە شتێك، دێت و لای الله پەیمانی نیە، ئەگەر ویستی دەیخاتە بەهەشتەوە).

**١٨٩** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (خەڵکینە؛ کاتی ئەوە هاتووە بۆتان کە واز بێنن لە سنورەکانی الله، هەر کەس توشی شتێك لەم کارە قێزەونە نەهی لێکراوانە بوو ئەوە با بە داپۆشینی الله خۆی داپۆشێت، چونکە هەر کەس

لاپەڕەكەیمان بۆ دەربخات - واتە تاوانەكەیمان بۆ ئاشكرا بكا - ، ئەوە بە كتێبی اللە حوكمی لەسەر دەدەین).

---

: واتە بۆ نمونە ئەگەر زینای كردبێ و كەس پێی نەزانیبێ ئەوا با دەست بەو داپۆشینەی اللە وە بگرێ، چونكە ئەگەر پەردە لەسەر خۆی لاببا بە كتێبی اللە حوكمی دەكەین، كە یان ئەوەتا جەڵدە یان بەرد بارانە .

محمد وتی: فەرموودەی لەم شێوەیەش زۆرن، جا پەند وەرگرە لە فەرمایشتی رسول اللە ﷺ: (هەر كەس توشی شتێك لەم كارە قێزەونە نەهی لێكراوانە بوو ئەوە با بە داپۆشینی اللە خۆی داپۆشێت)، ئەمە تەنها ئەوەیە كە ئومێدی پێ دەكرێ لە ڕەحمی اللە، خۆ ئەگەر ئەمە نەبوایە؛ ئەو دڵسۆز و ئەمینە كە ئاماژە بكا بە دان پێدانان، جا ئەو كات حەدەكە دەكەوتە سەری و دەبوو بە پاك بوونەوەیەك بۆ هەروەكو ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فێری بووە لەو بەشەی كە اللە بۆی داناوە لە كتێبەكەی، وەكو بورین و چاو پۆشی لێكردن، وە اللە تعالی ئەولاترە بە ڕەوشتە جوانەكان وەك لە بەندەكانی.

---

: واته پێغەمبەر ﷺ ئومێدی وابووە ئەگەر تۆ تاوانەکەت ئاشکرا نەکەیت مادام الله بۆی ستر کردوویت لێشت خۆش دەبێ ان شاء الله، خۆ ئەگەر لەبەر ئەم ئومێدە نەبوایە دەیفەرموو دان بە تاوانەکانتان بنێن با حەد لەسەرتان جێبەجێ بکەین و تاکو پاك ببنەوە لێی .

**١٩٠** - الأصمعي وتی: لای ابي عمرو بن العلاء بووین، عمرو بن عبید - کە یەکێکە لە سەرانی موعتەزیلە و قەدەریەکان - هات بۆ لای، وتی: ئەی ابو عمرو؛ ئایا الله بەڵێنەکانی دەشکێنێ؟

وتی: نەخێر .

وتی: نابینی کاتێك بەڵێنی پاداشتی لەسەر کردەوەیەك دابێ گەیاندویەتیە جێ؟

وتی: بەڵێ .

وتی: کەواتە دەبێ بە هەمان شێوەش بێ بۆ کردەوەیەك کە سزای دانابێ،.

ابو عمرو وتی: بەڵێن هەڕەشە نیە، عەرەب شکاندن بەوە هەژمار ناکات کە بەڵێنی شەڕێك بدەیت و نەیبەیتە سەر، بەڵکو شکاندن ئەوەیە بەڵێنی خێر بدەیت و نەیبەیتە سەر، پاشان ئەمەی خوێندەوە:

و لا يرهب ابن العم و الجار صولتي    و لا انثني من خشية المتهدد

و اني و ان اوعدته او وعدته    لمخلف ايعادي و انجز موعدي

**١٩١** - عمر بن الخطاب **رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه** فەرمووی: کاتێک الله واجبکەرەکانی دابەزاند کە ئاگر واجب دەکەن بۆ کەسێك ئەنجامیان بدات، وەکو: ﴿**وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا**﴾ [**النساء:** ٩٣] هاوشێوەکانی، ئێمە شاهێدیمان لەسەری بونیاد دەنا، تا ئەو کاتەی ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿**إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ**﴾ [**النساء:** ٤٨] جا وازمان لە شاهێدی دان هێنا، بەڵکو ترسمان بۆیان هەبوو - واتە بۆ تاوانبارانی ئیمانداران - .

**١٩٢** - یحیی وتی: پێم گەیشتووە لە علي بن أبي طالب **رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه** کە فەرموویەتی: فەقیهی ناو هەموو فەقیهەکان ئەو کەسەیە کە خەڵکی بێ ئومێد نەکات لە ڕەحمەتی الله، وە ڕێگاشیان پێنەدا بە سەرپێچیکردنی الله.

# دەروازەیەك دەربارەی خۆشویستنی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ



**محمد** وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە کە پیاو بیروباوەڕی هەبێ لەسەر خۆشویستنی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، وە چاکە و فەزڵەکانیان بڵاوبکاتەوە، دەم بگرێتەوە لەو ناکۆکیەی کە ڕوویداوە لە نێوانیان.

الله لە زیاتر لە شوێنێك لە کتێبەکەی سەنای کردوون، سەنایەك کە ڕێزگرتنی بۆ واجب کردوون بە خۆشویستن و دوعا کردن بۆیان، فەرموویەتی: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ﴾ تا فەرمایشتی: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا﴾ [**الفتح: ٢٩**] .

وە فەرموویەتی: ﴿لِلۡفُقَرَآءِ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأَمۡوَٰلِهِمۡ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗا﴾ تا فەرمایشتی: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ [**الحشر: ٩**]، هاوشێوەی ئەمانەش زۆرە لە قورئاندا.

**١٩٣** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (باشترینی ئوممەتەکەم ئەم سەردەمەی منە، پاشان ئەوانەی بەدوایاندا دێن، پاشان ئەوانەی بەدوایاندا دێن).

وهب ئەمەی بۆ باسکردم لە ابن وضاح لە الصمادحي لە ابن مهدي لە ابي عوانة لە ابي بشر جعفر بن اياس لە عبدالله بن شقيق لە ابي هريرة، فەرمووی: رسول الله ﷺ فەرمووی . . . فەرموودەکەی باسکرد.

**١٩٤** - لە سهل بن يوسف بن سهل بن مالك لە باوکیەوە لە باپیریەوە، فەرمووی: کاتێك رسول الله ﷺ گەڕایەوە لە حودەیبیە، وتاری دا بۆ خەڵکی، فەرمووی: (خەڵکینە، أبا بكر الصديق هەرگیز خراپەی لەگەڵ نەکردووم ئەوە بزانن، خەڵکینە من لە عمر و عثمان و علي و طلحة و الزبير و کۆچبەران و پشتیوانان ڕازیم ئەوە بزانن، خەڵکینە الله لە ئەهلی بەدر و حودەیبیە خۆش بووە، خەڵکینە خراپ مەبن لەگەڵم دەربارەی هاوەڵان و خزمەکانم، خەڵکینە الله داوای لێ نەکردوون بە کردنی ستەم دەربارەیان، چونکە ئەوە لە نەبەخشراوەکانە).

**١٩٥** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (کاتێک باسی قەدەر کرا زمانتان بگرن، کاتێکك باسی ئەستێرەکان کرا زمانتان بگرن، کاتێك باسی هاوەڵانم کرا زمانتان بگرن).

النضر وتی: وە گوێم لە أبي قلابة بوو بە أيوب ی دەوت: ئەی أيوب سێ شت لە منەوە وەربگرە: لەگەڵ ئەهلی ئارەزووەکان دامەنیشە و گوێیان لێمەگرە، وە قورئان بە ڕای خۆت تەفسیر مەکە لەبەر ئەوەی هیچی لەسەر تۆ نیە، وە ئاگات لەو دە هاوەڵەی رسول الله ﷺ بێت بە چاکە نەبێ باسیان مەکە.

**١٩٦** - میمون بن مهران وتی: سێ شت هەیە ڕەتی بکەنەوە: موجادەلە کردن لەگەڵ هاوەڵانی ئارەزوو، وە جوێندان بە هاوەڵانی رسول الله ﷺ، وە ڕوانین بۆ ئەستێرەکان - مەبەستی خودی ئەستێرەکان نیە بەڵکو مەبەستی ئەو فاڵچێتیەیە کە بە هۆی ئەستێرەکانەوە دەکرێ - .

**١٩٧** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (واز لە هاوەڵانم بێنن، جوێن بە هاوەڵانم مەدەن، ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە هەموو ڕۆژێك هێندەی کێوی ئوحود ببەخشێ ئەوە ناگات بە مشتێک یان نیوەی مشتێکی ئەوان).

**١٩٨** - أيوب السختياني وتی: هەرکەس أبا بكر ی خۆشویست ئەوە دینی ڕاگیر بووە، وە هەر کەس عمر ی خۆشویست ئەوە ڕێگای بۆ ڕوون بووەتەوە، وە هەر کەس عثمان ی خۆشویست بە نوری الله ڕووناك دەبێتەوە، وە هەر کەس علي خۆشویست ئەوە دەستی گرتووە بە گوریسێکی پتەووەوە، وە هەر کەس سەنای باشەی هاوەڵانی رسول الله ﷺ بکات ئەوە بەری بووە لە نیفاق، وە هەر کەس لە یەکێکیان کەم بکاتەوە یان ڕقی لێیان بێ لەبەر شتێك کە تێیاندابووە، ئەوە موبتەدیعە، پێچەوانەکاری سوننەت و سەلەفی صالحە، وە دەترسم هیچ

کردەوەیەکی بەرز نەبێتەوە بۆ ئاسمان تا ئەو کاتەی هەموویانی خۆش دەوێ و دڵی لە بەرامبەریان سەلامەت دەبێت.

**١٩٩** - مالك وتی: لە فيء دا هیچ بەشێك نیە بۆ کەسێك کە کەم و کورتی بگرێ لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ.

---

: فيء ئەو بەشەی دەستکەوتە کە بە بێ شەڕ کردن دەکەوێتە دەستی موسڵمانان .

# دەروازەیەك دەربارەی پێشخستنی أبو بكر و عمر و عثمان و علي



محمد وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە کە باشترینی ئەم ئوممەتە دوای پێغەمبەرەکەمان ﷺ: أبو بكر و عمر ن، باشترین کەسیش دوای ئەوان: عثمان و علي ن.

**٢٠٠** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (الله هاوەڵانی هەڵبژارد بەسەر هەموو جیهانیاندا، جگە لە پێغەمبەران و نێردراوان، وە چواری لە هاوەڵانم بۆ هەڵبژاردم: أبو بكر، عمر، عثمان، علي، کردنی بە باشترینی هاوەڵانم، وە لە هەموو هاوەڵانم خێر و باشە هەیە، وە ئوممەتەکەمی هەڵبژارد بەسەر ئوممەتەکانی تردا).

**٢٠١** - ابن عمر **رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما** دەفەرموێ: ئێمە فەزڵمان دەدان لە کاتێکدا رسول الله ﷺ و هاوەڵانی ئامادە بوون، دەمانوت: رسول الله ﷺ، دواتر أبو بكر، و عمر، و عثمان، دواتر بێدەنگ دەبووین.

**٢٠٢** - الحسن وتى: گەشتووم بە ژمارەيەك لە هاوەڵانى رسول الله ﷺ كە ئەوان أبا بكر و عمر و عثمان يان فەزڵ دەدا.

**٢٠٣** - أبو صالح الجهني وتى: بە شريك م وت چى دەڵێى دەربارەى ئەو كەسەى علي فەزڵ دەدا بەسەر أبي بكر و عمر؟

وتى: عەيبى گرتووە لە دوازدە هەزار كەس لە هاوەڵانى پێغەمبەر ﷺ .

وتى: دواتر خێرا چووم بۆ لاى سفيان الثوري پرسيارم لێكرد دەربارەى ئەوە؟

وتى: عەيبى گرتووە لە دوازدە هەزار كەس لە هاوەڵانى رسول الله ﷺ، ترسم لێى هەيە كە هيچى كردەوەيەكى بەرزنەبێتەوە بۆ ئاسمان.

**٢٠٤** - أبي هريرة **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** فەرمووى: ئێمە گرۆى هاوەڵانى رسول الله ﷺ بووين و ئێمە ئامادە بووين و دەمان وت: باشترينى ئوممەت دواى پێغەمبەرەكەى ﷺ: أبو بكر دواتر عمر دواتر عثمان دواتر بێدەنگ دەبووين.

**٢٠٥** - ابن وضاح وتى: پرسيارم لە يوسف بن عدي كرد، پێم وت: أبو بكر و عمر باشترينى ئەم ئوممەتەن دواى پێغەمبەرەكەى ﷺ؟

وتى: بەڵێ، كەس لەمەدا ڕا جياوازى نيە مەگەر ئەو كەسەى بە لايەوە گرنگ نەبێ، ئەگەر دەتەوێ فەزڵيان بزانيت سەير بكە بزانە الله كێى داناوە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە گۆڕدا .

يوسف وتی: بەڵكو ڕا جیاوازیەكە كەوتە سەر فەزڵدان لە نێوان عثمان یان علي، من دەڵێم: أبو بكر، عمر، عثمان، علي، ئەمە ڕای منە، وە ڕای ئەو كەسانەشە كە پێیان گەشتووم لە ئەهلی سوننە، جگە لەمەش هیچ وتەیەك گونجاو نیە.

**٢٠٦** - عبدالله بن المبارك وتی: كۆدەنگی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وەردەگرین و واز لە جگە لەوە دێنین، هەموویان كۆدەنگ بوون كە عثمان باشترینیان بووە، بۆیە عثمان باشترینی ئەم ئوممەتەیە لە دوای أبي بكر و عمر، وە دوای ئەوانیش علي، پاشان باشترینی ئەم ئوممەتە دوای ئەو چوارە: هاوەڵانی شورایە، پاشان ئەهلی بەدرە، پاشان ئەوانەی سەرەتا و ئەوانەی سەرەتا لە باقی هاوەڵانی رسول الله ﷺ، حەقی پێشەنگیان پێ دەزانرێ - واتە ئەوانەی لە پێشتردا ئیمانیان هێناوە باشترن لەوانی دواتر - .

**٢٠٧** - النزال بن سبرة وتی: كاتێك عبدالله لە مەدینەوە هات دوای شەهیدكردنی عمر، وتی: باشترین كەسی لەوەی مابووەوە كرد بە كاربەدەستمان، سوێندیشمان نەخوارد، واتە: عثمان، وهب وتی: ابن وضاح پێی وتم: ئەوە بۆچوونی منیشە.

# دەروازەیەك دەربارەی واجبێتی بیستن و گوێڕایەڵی



محمد وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە دەسەڵاتدار سێبەری الله یە لەسەر زەوی، وە هەر کەس بەسەر خۆیەوە دەسەڵاتداری نەبینی، دەسەڵاتداری چاکەکار بێ یان خراپەکار، ئەوە ئەو کەسە لەسەر پێچەوانەی سوننەتە.

الله فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ﴾ **[النساء: ٥٩]**.

وە ئەهلی عیلم تەفسیری ئەم ئایەتەیان کردووە بە تەفسیرگەلێك کە هەموویان بەرەو یەك واتا دەڕۆن ئەگەر لێکۆڵەر لێی بکۆڵێتەوە، الحسن البصري دەیوت: ئەوانە زاناکانن.

ابن عباس **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** دەیفەرموو: ئەوانە سەرکردەی سریەکانن، رسول الله ﷺ کاتێك سریەیەکی دەنارد پیاوێکی دەکرد بە فەرمانڕەوایان، وە فەرمانی پێدەکردن سەرپێچی نەکەن، و گوێی لێبگرن و گوێڕایەڵی بکەن.

زيد بن أسلم **رَضِيَ اللَّهُ عَنْه** دەیفەرموو: ئەوانە کار بەدەستانن، مەگەر نابینیت الله بەوان دەستی پێکردووە و فەرموویەتی: ﴿**إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا**﴾ [**النساء: ٥٨**] .

واتە: ئەو دەسکەوت و صەدەقانەی کە پێی سپاردوون بە کۆکردنەوە و دابەشکردنیان: ﴿**وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ**﴾ [**النساء: ٥٨**] .

فەرمووی: بەمە فەرمانی کرد بە کار بەدەستان، پاشان ڕووی کردە ئێمە و فەرمووی: ﴿**يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ**﴾ [**النساء: ٥٩**]، ئەگەر هیچ ماڵێکتان نەبوو - بۆ صەدەقە کردن - .

فەرمووی: پاشان دەرچوو و فەرمووی: ﴿**يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ**﴾ [**النساء: ٥٩**] : عاقیبەت - واتە ئەگەر ناکۆکیتان تێکەوت بیگەڕێننەوە بۆ الله و پێغەمبەرەکەی و بەوە چارەسەری کەن، هەر عاقیبەتی ئەم کارە باشتر دەردەچێ، والله اعلم - .

محمد وتی: جا بیستن و گوێڕایەڵی بۆ کار بەدەستان واجبە، هەر چەندە کەمتەرخەمی لە خودی خۆیان بکەن واجبی خۆیانیش نەگەیەنن، تەنها ئەوە نەبێ کە بانگەواز دەکرێن بۆ حەق و فەرمانیان بەوە پێ دەکرێ و نیشانیان دەدرێ، جا ئەوەیان دەکەوێتە سەر کە هەڵیانگرتووە و خەڵکەکەشیان بیستن و گوێڕایەڵیان لەسەرە بۆیان - واتە ئەگەر ئەوان کەمتەرخەمیش بوون خەڵکی دەبێ بە گوێیان بکەن، دواتر تاوانی خۆیان لەسەر خۆیانە - .

**٢٠٨** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (بەردەوام ئەم فەرمان بەدەستیە لەناو قورەیشدایە تا دوو کەسیش بمێنن لە ناو خەڵکیدا).

**٢٠٩** - پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (خەڵکی شوێنکەوتەی قورەیشن لەم فەرمان بەدەستیەدا، باشترینیان لە جاهیلیدا باشترینیانە لە ئیسلام).

**٢١٠** - لە علقمة بن وائل الخضرمي ەوە، لە باوکیەوە، وتی: یزید بن سلمة الجعفي پرسیاری لە رسول الله ﷺ کرد، وتی: یا رسول الله ﷺ، ئەگەر کار بەدەستانێك هاتنە سەرمان داوای حەقی خۆیان کرد و لە حەقی خۆمان بێ بەشمان بکەن، فەرمانمان بە چی پێ دەکەی بۆ ئەو کات؟

- رسول الله ﷺ - پشتی تێکرد، پاشان پرسیاری لێکردەوە، پشتی تێکرد، بۆیە الأشعث بن قیس ڕایکێشا لە سێیەمدا یان لە دووەمدا.

رسول الله ﷺ فەرمووی: (گوێڕایەڵیان بن و شوێنیان بکەون، لەسەریانە ئەوەی ئێوە هەڵیان گرتووە، وە لەسەرتانە ئەوەی ئەوان هەڵتان گرتووە).

**٢١١** - ابن مسعود **رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه** فەرمووی: رسول الله ﷺ فەرمووی: (کار بەدەستانێك و کاروبارانێك دێن کە ئێوە ڕقتان لێیان دەبێتەوە) .

وتمان: فەرمانمان بە چی پێ دەکەی ئەگەر یەکێکمان گەشت بەوە؟

فەرمووی: (ئەو حەقەی لەسەرتانە دەیگەیەنن، وە ئەوەی هی خۆتانە لە اللە ی داوا دەکەن).

**٢١٢** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (هەرکەس شتێکی خراپی بینی لە فەرمانڕەواکەی با ئارام بگرێت، چونکە هیچ کەسێك کە لە کۆمەڵی موسڵمانان جیا نابێتەوە و نامرێت ئیللا بە مردنێکی جاهیلی دەمرێ).

**٢١٣** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (من فەرمانتان پێدەکەم بە پێنج شت کە الله فەرمانی پێکردووم: کۆمەڵی موسڵمانان، بیستن، گوێڕایەڵی، کۆچ، وە جیهاد لە پێناوی الله، جا هەر کەس خۆی لە کۆمەڵی موسڵمانان جیا بکاتەوە، ئەوە ئیسلامی لە سەری داکەندووە، ئیللا تا دەگەڕێتەوە، وە هەر کەس بانگەشەیەکی جاهیلی بکات ئەوە لە دانیشتووی دۆزەخە) .

پیاوێك وتی: ئەگەر نوێژ بکات و ڕۆژووش بگرێت؟

فەرمووی: (ئەگەر نوێژ بکات و ڕۆژووش بگرێت، بانگ بکەن بەوەی الله ناوی لێناون، موسڵمانان، ئیمانداران، بەندەکانی الله).

**٢١٤** - سوید بن غفلة وتی: عمر دەستی گرتم، فەرمووی: ئەی أبا أمیة من نازانم، لەوانەیە بە یەکتر نەگەین لە دوای ئەمڕۆمانەوە!!! لە الله بترسە بۆ ئەو ڕۆژەی پێی دەگەیتەوە، وەکو بڵێی دەیبینیت، وە شوێن ئیمام بکەوە، ئەگەر بێتو بەندەیەکی حەبەشی لێو و لوت و گوێ قرتاویش بێ؛ گەر لێیدای ئارام بگرە، گەر سوکایەتی پێکردی ئارام بگرە، وە ئەگەر فەرمانی پێکردیت بە شتێك لە

دینەکەت کەم بکاتەوە، بڵێ: گوێڕایەڵی لە منەوەیە، خوێنم لە پێناو دینەکەمدایە، وە لە کۆمەڵی موسڵمانان جیامەبەرەوە.

**٢١٥** - محمد بن المنكدر وتی: کاتێك بەیعەت بە يزيد بن معاوية درا، ئەمە بۆ ابن عمر باسکرا، فەرمووی: ئەگەر باش بێت ڕازی دەبین، ئەگەر خراپیش بێت ئارام دەگرین.

# دەروازەیەك دەربارەی نوێژ كردن لە پشت كار بەدەستانەوە



محمد وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە كە نوێژی جومعە و دوو جەژنەكە و عەرەفە لەگەڵ هەموو فەرمانڕەوایەكدا؛ چاكەكار بێ یان خراپەكار؛ لە سوننەتە و حەقە، وە ئەگەر كەسێك نوێژی لەگەڵیان كرد پاشان دووبارەی كردەوە، دەرچووە لە كۆمەڵی موسڵمانانی ڕابردوو، لە پێشینی چاكی ئەم ئوممەتە، ئەمەش لەبەرئەوەیە كە الله فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ﴾ [**الجمعة: ٩**].

وە الله ئەو كاتەی كە بە دەمەوە چوونیان و وەڵامدانەوەی بانگی لەسەریان فەرزكرد دەیزانی كە: كاربەدەستە تاوانبار و فاسقەكان نوێژیان پێ دەكەن، هەر كەس نەیزانیبێ هی ئەوە نەبووە كە بە دەمەوە چوون بۆ شتێك لەسەر بەندەكانی فەرز بكا كە پاداشت وەرناگرن بە شاهێدی دان پێی و گێڕانەوە ی لەسەریان واجب بكا، وە قازی و حاكمەكان و ئەوانەی دایانناون بۆ نوێژ؛ نوێژ لە پشتیابەوە دروستە.

**٢١٦** - عبدالملك دەربارەی تەفسیری ئەو ئاثارانەی هاتووە: (نوێژ دروستە لە پشتی هەموو چاکەکار و خراپەکارێك) .

وتی: مەبەست ئەو ئیمامەیە کە گوێڕایەڵی دەکرێت، چونکە ئەگەر نوێژ لە پشتیەوە درووست نەبێت یان لە پشتی ئەوەی ئەو دایناوە لەگەڵ جێنشینەکانی، ئەوە خوێن ڕشتن و حەڵاڵ کردنی دامێن و فیتنە درووست دەبێت، بۆیە نوێژ لە پشتیانەوە دروستە، جومعە و جگە لە جومعەش، مادام نوێژ بکەن لە کاتی خۆیدا، وە هەر کەس لەوان ناسرا بە کۆمەڵێك لە ئارەزووی پێچەوانەی کۆمەڵی موسڵمانان، وەکو: ئیباضی و مورجیئە و قەدەری، ئەوەش نوێژکردن لە پشتیانەوە کێشەی نیە.

عبدالملك وتی: ئەمەش ئەوەیە کە ئەهلی سوننەی لەسەر بووە.

**٢١٧** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (نوێژ بکەن لە پشتی هەموو ئیمامێك: چاکەکار یان خراپەکار)، واتە: کاربەدەستان.

**٢١٨** - سوار بن شبیب وتی: نجدة الحروري حەجی کرد لەگەڵ هاوەڵانی، وازی لە ابن الزبیر هێنا، جا ئەم ڕۆژ و شەوێك نوێژی بۆ خەڵکی کرد، وە ئەویش ڕۆژ و شەوێك نوێژی بۆ خەڵکی کرد، ابن عمر یش نوێژی کرد لە پشتی هەردووکیانەوە، بۆیە پیاوێك ڕەخنەی لێگرت .

وتی: ئەی أبا عبدالرحمن ئایا نوێژ لە پشتی نجدة الحروري دەکەی؟

ابن عمر فەرمووی: کاتێك بانگیان کرد: وەرن بۆ باشترین کار وەڵامیان دەدەینەوە، وە کاتێك بانگیان کرد: وەرن بۆ کوشتنی نەفسێك، دەڵێین: نەخێر! وە بەمە دەنگی بەرز کردەوە.

# دەروازەیەك بردنی زەكات بۆ كاربەدەستان



محمد وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە كە بردنی زەكات بۆ لای كاربەدەستان دروستە، الله ئەمەی داناوە لە فەرمایشتی: ﴿أَن تُؤَدُّواْ ٱلْأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا﴾ [النساء: ٥٨].

وە لە فەرمایشتی بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ : ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا﴾ [التوبة: ١٠٣].

**٢٢٢** - جابر رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه فەرمووی: عەرەبەكان هاتن بۆ لای رسول الله ﷺ، وتیان: یا رسول الله، صەدەقە وەرگرەكان ستەممان لێ دەكەن .

فەرمووی: (صەدەقە وەرگرەكانتان ڕازی بكەن، ئەگەر ستەمیشیان كرد).

جابر فەرمووی: جا ڕێگریم لە صەدەقە وەرگرێك نەكردووە لەو كاتەوەی كە گوێم لە رسول الله ﷺ بوو وای دەفەرموو.

**٢٢٣** - له سهيل بن أبي صالح، له باوكيەوه؛ كه پرسيار له عبدالله بن عمر و سعد بن أبي وقاص و أبا سعيد الخدري دەكات دەربارەی زەكات: جێبەجێی دەكا لەسەر ئەوەی الله فەرمانی پێ كردووه یان دەیبا بۆ لای كاربەدەستان؟ فەرموویان: بەڵكو دەیبا بۆ لای كاربەدەستان.

**٢٢٤** - محمد بن سيرين وتی: زەكات له خراپەكار و جگه لەویش دەبرا بۆ لای رسول الله ﷺ و ئەو كەسەی كه ئەو كاری پێ سپاردووه، وه بۆ لای أبي بكر و ئەو كەسەی كه ئەو كاری پێ سپاردووه، وه بۆ لای عمر و ئەو كەسەی كه ئەو كاری پێ سپاردووه، وه بۆ لای عثمان و ئەو كەسەی كه ئەو كاری پێ سپاردووه، بەڵام كه معاوية و دوای ئەویش هاتن، خەڵكی جیاوازییان تێكەوت، هەبوو دەیبرد بۆ لای، وه هەبوو دەیبەخشی.

**٢٢٥** - مالك وتی: ئەگەر پێشەوا دادگەر بوو، بۆ خەڵكی نیه كه زەكاتەكانیان جیا بكەن، وه واجبه لەسەریان بیبەن بۆ لای ئیمام.

عبدالملك وتی: جا كه كاربەدەستان دادگەر بوون له زەكاتەكان، مالك و هاوەڵانی و جگه لەوانیش له ئەهلی عیلم فەرمانیان دەكرد بەوەی ئەو حەقەیان پێ بدرێ، وه بۆ سەلامەتی بدرێ بەوان، وه ئەگەر ترسی سزایان لێیان هەبوو با بیبەن بۆ لایان، وه ئەو تاوانەی دەیكەن پێیەوه لەسەر ئەوانه، و پاداشتەكەشی بۆ ئەو كەسەیه كه لێی وەردەگرن.

# دەروازەیەك دەربارەی حەج و جیهاد كردن لەگەڵ كاربەدەستان



محمد وتی: وە لە وتەی ئەهلی سوننە ئەوەیە كە حەج و جیهاد لەگەڵ هەموو چاكەكار و خراپەكارێك لە سوننەتە و حەقە، الله ﷻ حەجی فەرزی كردووە، و فەرموویەتی: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ﴾ **[آل عمران: ٩٧]** .

وە فەزڵی جیهادی فێركردووین لە زیاتر لە جێگایەك لە كتێبەكەی، حاڵی ئەو كاربەدەستانەشی زانیوە كە حەج و جیهاد ڕاگیر نابن مەگەر لەگەڵ ئەوان نەبێ، جا بە مەرجی دانەناوە و ڕوونییشی نەكردۆتەوە: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّٗا﴾ **[مريم: ٦٤]**.

**٢٢٦** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (جیهاد بەردەوامە لەو كاتەوەی الله منی ناردووە تا كۆتا ئوممەتم دەجەنگن لەگەڵ دەجال، ستەمی هیچ ستەمكارێك و دادەگەری هیچ دادگەرێك بەتاڵی ناكاتەوە).

**٢٢٧** - عبدالملك بن حبيب وتى: گوێم لە ئەهلى عيلم بوو دەيانوت: جيهاد كێشەى تيا نيە لەگەڵ كاربەدەستان، ئەگەر چى يەك لەسەر پێنجيش نەخەنە شوێنى خۆى - مەبەستى يەك لەسەر پێنجى ئەو بەشەى دەسكەوتەكە كە الله باسى كردووە لە سورەتى الأنفال, كە ئەو بەشە بۆ الله و پێغەمبەرەكەيەتى - ، وە ئەگەر چى بە ئەمەك نەبن بەرامبەر پەيمان ئەگەر پەيمانيان دا، وە ئەگەر چى ئەوە بكەن كە دەيكەن، خۆ ئەگەر وازهێنان لە غەزا لەگەڵيان دروست بوايە بۆ خەڵكى لەبەر خراپى حاڵيان، ئەوا ئيسلام زەليل دەبوو، و لقەكانى دەترسێنرا و دامێنەكان حەڵاڵ دەكران، وە شيرك و ئەهلەكەى بەرز دەبوونەوە.

**٢٢٨** - رسول الله ﷺ فەرمووى: (كۆمەڵێك دێن دواى من گومان لە جيهاد دەكەن، لەو ڕۆژەدا موجاهيد هەمان ئەو شتەى هەيە كە موجاهيدى ئەمڕۆ لەگەڵ من هەيەتى).

**٢٢٩** - مغيرة وتى: پرسيار كرا لە إبراهيم النخعي دەربارەى جيهاد لەگەڵ ئەو كاربەدەستانە؟

وتى: ئەوە تەنها مەيلێكە لە شەيتانەوە بۆ ئەوەى بێ هيوا بن لە جيهادەكەتان .

پێى وترا: ئەوان بانگەواز ناكەن .

وتی: خۆ دەیلەم و ڕۆمەکان دەزانی کە لەسەر چی جەنگیان لەگەڵ دەکرێت.

**٢٣٠** - لە عبدالرحمن بن يزيد بن أسلم، لە باوکیەوە؛ کە رسول الله ﷺ فەرمووی: (بەردەوام جیهاد جوان و سەوزە هەتا دڵۆپێك لە ئاسمانەوە بێتە خوارەوە، سەردەمێك دێت بەسەر خەڵکیدا کە قورئان خوێنەکانی ناویان دەڵێن: ئەم سەردەمە سەردەمی جیهاد نیە، هەر کەس گەشت بەوە، ئەوە باشترین سەردەمی جیهادە) .

وتیان: یا رسول الله ﷺ، کەس هەیە وا بڵێت؟

فەرمووی: (بەڵێ، هەر کەس لەعنەتی الله و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەر بێت).

عبدالملك وتی: ئەمە وتەی مالك و هەموو هاوەڵانیەتی، وای نابینن جیهاد کردن لەگەڵیان کێشەی تیا بێت.

**٢٣١** - زهير بن عباد وتی: ئەوانەی پێیان گەشتووم لە شێخەکان: مالك و سفيان و الفضيل بن عياض و ابن المبارك و وكيع و جگە لەوانیش، حەجیان دەکرد لەگەڵ هەموو خەلیفەیەك.

# دەروازەیەك دەربارەی نەهی كردن لە دانیشتن لەگەڵ ئەهلی ئارەزوو وە ئەو شتانەی دایان ناوە



محمد وتی: وە بەردەوام ئەهلی سوننە عەیبیان لە ئەهلی ئارەزووە گومڕاكەرەكان گرتووە، وە ڕێگریان لە دانیشتن لەگەڵیان كردووە، وە لە فیتنەكانیان ترساندویانن، وە جیاوازی ئەوانیان ڕاگەیاندووە، ئەمەش وەكو غەیبەت كردنیان و تانە لێدان نابینن.

**٢٣٢** - رسول الله ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿**هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ**﴾ [**آل عمران**: ٧] .

پاشان فەرمووی: (هەر كاتێك ئەوانەتان بینی كە شوێن موتەشابیهەكەی دەكەون، ئەوە ئاگاداریان بن).

**٢٣٣** - أبي غالب دەڵێ: لەگەڵ أبي أمامة بووم، ئەو لەسەر گوێدرێژ بوو، تا گەشتین بە قادرمەكانی مزگەوتی دیمەشق، جا كۆمەڵێك لە سەرانی خەواریج دانرا بوون، فەرمووی: ئەم سەرانە چین؟

وتيان: سەری خەواریجەکانن هێناویانن لە عێراقەوە، فەرمووی: (سەگەکانی ئەهلی دۆزەخ، سەگەکانی ئەهلی دۆزەخ، سەگەکانی ئەهلی دۆزەخ، خراپترین کوژراو لە ژێر سێبەری ئاسماندا، خراپترین کوژراو لە ژێر سێبەری ئاسماندا، خراپترین کوژراو لە ژێر سێبەری ئاسماندا، خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی دەیانکوژێ یان دەیکوژن، خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی دەیانکوژێ یان دەیکوژن، خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی دەیانکوژێ یان دەیکوژن) پاشان گریا، وتم: چی گریاندتی؟

فەرمووی: ڕەحمێك بۆیان، ئەوان لە ئەهلی ئیسلام بوون دەرچوون لە ئیسلام، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿**هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ**﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە، پاشان ئەمەی خوێندەوە: ﴿**وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَٱخۡتَلَفُواْ**﴾ تا فەرمایشتی: ﴿**فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ**﴾ **[آل عمران: ١٠٥، ١٠٦]** .

پێم وت ئەوانە خۆیانن ئەی أبا أمامة؟

فەرمووی: بەڵێ .

وتم: شتێك دەڵێی بە ڕای خۆت یان گوێت لە رسول الله ﷺ بووە بیڵێ؟

فەرمووی: ئەو کات من چاو قایمم، ئەو کات من چاو قایمم، ئەو کات من چاو قایمم، جگە لە جارێك و دوو جار گوێم لێبووە لە رسول الله وە ﷺ، تا گەیشتە حەوت جار، و پەنجەی خستە گوێچکەکانی .

پاشان فەرمووی: ئەگەر نا بێدەنگ دەبووم .

پاشان فەرمووی: گوێم لە رسول الله ﷺ بوو دەیفەرموو: (نەوەکانی ئیسرائیل جیابوونەوە بۆ حەفتا تاقم، دانەیەکیان لە بەهەشتە و ئەوانی تر لە دۆزەخن) .

پێم وت: ئەم ئوممەتە دانەیەکی زیادە بەسەریانەوە، دانەیەکیان لە بەهەشتە و ئەوانی تر لە ئاگرن، پێم وت: فەرمانم بە چی پێدەکەی؟

فەرمووی: دەست بگرن بە ڕەشاییە گەورەکەوە - واتا: حەق و ئەهلەکەی - .

پێم وت: چی دەبینیت لەو ڕەشاییە گەورە؟

فەرمووی: بیستن و گوێڕایەڵی باشترە لە تاقم تاقمێنە و سەرپێچی.

**٢٣٤** - پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لەعنەت کراوە لە قەدەری و مورجیئە لەسەر زمانی حەفتا پێغەمبەر، کۆتا دانەیان محمد ە).

**٢٣٥** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (دەردەچن لە ئیسلام وەکو دەرچوونی تیر لە کەوانەکەی).

**٢٣٦** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (لەگەڵ هاوەڵانی قەدەردا دامەنیشن، وە دەست پێشخەری مەکەن بەرەو ڕوویان).

**٢٣٧** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (هاوەڵانی قەدەر مەجوسی ئەم ئوممەتەن).

**٢٣٨** - أبي الزبير المكي وتی: بۆ عبدالله بن العباس باس کرا کە خەڵکانێك قسە لە قەدەردا دەکەن، وە هەندێك لەوەی ئەوان دەیڵێن بۆی باسکرا، بۆیە فەرمووی: ئایا کەس لەوان لە کەعبەیە تا بۆی هەڵسم و قوڕگی بتەقێنم؟

: ابن عباس لەو کاتەدا نابینا بوو .

**٢٣٩** - ابن وهب وتی: ابن مهدي پێی وتم کە پیاوێك پرسیاری لە إبراهيم النخعي کرد دەربارەی ئارەزووەکان؛ ئایا خێرن؟

وتی: الله هێندەی گەردیلەیەك خێری تێیاندا دانەناوە، هیچیش نین جگە لە ڕازاندنەوەیەك لە شەیتانەوە، کاروبارەکەش هەر کاروباری سەرەتایە.

**٢٤٠** - ابن وهب وتی: مالك پێی وتم کە عمر بن عبدالعزيز لە نامەکانیدا دەینووسی: من ئاگادارتان دەکەمەوە لەوەی ئارەزوو و لادانی دوور مەیلیان بۆی چووە.

إبن وهب وتی: وه گوێم له مالك بوو دەیوتەوه، وه پرسیاری لێ کرا دەربارەی دەمه دەمێ ئەهلی قەدەر و قسەکانیان؟

وتی: هیچ کەسیان تێدانیه زانا بێ بەوەی لەسەرین، بۆیه وته لەگەڵیان دانانرێ وه جیاوازیان ڕاناگەیەنرێ، و نوێژ له پشتیانەوه ناکرێت، وای نابینم نیکاحیشیان لەگەڵدا بکرێت.

إبن وهب وتی: وه گوێم لێی بوو دەیوت: ئەو پیاوه کاتێك هەندێك له ئەهلی ئارەزووەکان بهاتنایەته لای، دەیوت: من لەسەر دڵنیاییم له پەروەردگارمەوه، بەڵام تۆ به گومانیت، بۆیه بڕۆ بۆ لای کەسێك که وەکو خۆت به گومان بێ، و دەمه دەمێ لەگەڵدا بکه.

**٢٤١** - له زید بن اسحاق الأنصاري، له عطاء بن أبي رباح ەوه که دەربارەی هاوەڵانی ئارەزووەکان بەوانەی لەگەڵی دانیشتبوون وت: ئەگەر کەسێکتان لێیان بینی لامان دانیشتووه، ئەوا نیشانەیەکی نێوانیانم پێ نیشان بدەن، جا ئەگەر کەسێك لەوان لای دابنیشتایه پێیان دەوت، نەعلەکانی هەڵدەگرت و دەڕۆشت.

**٢٤٢** - یزید الخراساني وتی: گوێم له وهب بن منبه بوو دەیوت: حەفتا و دوو کتێبم خوێندۆتەوه، هیچ کتێبێکیان نەبوو ئیللا تێیدا ئاگاداری درا بوو: هەرکەس شتێکی له قەدەری الله دایه پاڵ خۆی، ئەوه کافر بووه به الله ی مەزن.

**٢٤٣** - مصعب بن سعد وتی: باوكم پێی وتم: كوڕم، لەگەڵ توشبوو بە فیتنە دامەنیشە، چونكە لە یەكێك لەم دوو شتە مەڵە ناكا: یان دەتخاتە هەڵەوە، یان دڵت نەخۆش دەخات.

**٢٤٤** - أبو قلابة كە یەكێك لە فەقیهە خاوەن ژیریەكان، وتی: لەگەڵ ئەهلی ئارەزووەكان دامەنیشن، و دەمە دەمێیان لەگەڵ مەكەن، چونكە من ئەمین نیم لەوەی نوقمتان نەكەن لە گومڕاییەكانی خۆیان، یان ئەوەی دەیزانن لێتان بشێوێنن.

**٢٤٥** - محمد بن سيرين وای دەبینی ئەم ئایەتە دەربارەی ئەهلی ئارەزووەكان دابەزیوە: ﴿**وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦ**﴾ **[الأنعام: ٦٨]** .

**٢٤٦** - أبي الجوزاء وتی: ئەگەر مەیمون و بەراز دراوسێیەتیم بكەن، پێم خۆشترە لەوەی پیاوێك لە ئەهلی ئارەزووەكان دراوسێیەتیم بكات، وە كەوتنە ناو ئەم ئایەتە: ﴿**يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّواْ مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ وَمَا تُخْفِى صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ**﴾ **[آل عمران: ١١٨]** .

**٢٤٧** - مجاهد وتی: نازانم كام لەم دوو نیعمەتە گەورەترە بەسەرمەوە؛ ئەوەی هیدایەتی داوم بۆ ئیسلام، یان ئەوەی بەدووری گرتووم لە ئارەزووەكان؟

**٢٤٨** - أبي العالية وتی: نازانم کام لەم دوو نیعمەتە گەورەترە بەسەرمەوە؛ نیعمەتێکیان کە پێی داوم ڕزگاری کردووم لە شیرك، یان نیعمەتێکیان کە پێیداوم ڕزگاری کردووم لە حەڕوریە؟

**٢٤٩** - مالك وتی: هیچ ئایەتێك لە کتێبی الله هێندەی ئەم ئایەتە لەسەر ئەهلی ئارەزووەکان توند نیە: ﴿**يَوۡمَ تَبۡيَضُّ وُجُوهٞ وَتَسۡوَدُّ وُجُوهٞۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡوَدَّتۡ وُجُوهُهُمۡ أَكَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ**﴾ **[آل عمران: ١٠٦]** .

مالك وتی: جا چ کەلامێك لەمە ڕوونترە؟

إبن القاسم وتی: مالك پێی وتم: ئەم ئایەتە بۆ ئەهلی قیبلەیە.

سحنون وتی: ابن غانم دەربارەی خراپی دانیشتن لەگەڵ ئەهلی ئارەزووەکان دەیوت: دەبینیت یەکێکتان دابنیشێ لەلای دزێك وە تورەکەکەی شتێکی تێدا بێت، مەگەر دوور ناکەوێتەوە لێی، لە ترسی ئەوەی بیبات؟ جا دینەکەتان ئەولاترە بەوەی بە دووری بگرن و پارێزگاری لێبکەن.

پێی وترا: ئەی ئەگەر کۆبووینەوە لەگەڵیان لە ثغر - ثغر بە شوێنێك دەوترێ کە موسڵمان و کافر لێك جیادەکاتەوە - دەریان بکەین؟

وتی: بەڵێ.

سحنون وتی: وە أشهب وتی: پرسیار کرا لە مالك دەربارەی قەدەریەکان؟

وتی: کەسانێکی خراپن، دامەنیشن لەگەڵیان .

پێی وترا: وە نوێژیش ناکرێ لە پشتیانەوە؟

وتی: بەڵێ.

# دەروازەیەك دەربارەی تەوبە كردن بە ئەهلی ئارەزووەكان، وە جیاوازی ئەهلی عیلم لە تەكفیر كردنیان



محمد وتی: ئەهلی عیلم جیاوازیان تێكەوت لە تەكفیر كردنی ئەهلی ئارەزووەكان :

جا تێیاندایە وتویەتی: ئەوانە كافرن، بە نەمری دەمێننەوە لە دۆزەخدا.

وە تێیاندایە نایانگەیەنێ بە كوفر و لە ئیسلام دەریان ناكا، وە دەڵێ: ئەوەی ئەوانی لەسەرە فیسق و سەرپێچیە، تەنها ئەوە نەبێ كە توندترین فیسق و تاوانە، ئەمەش مەزهەبی شێخەكانمانە لە ئەندەلوس، وە ئەوەیە كە باوەڕیان پێیەتی، وە دەڵێن: قسە و بەڵگە هێنانەوە بۆ كەسیان دانانرێ، بەڵكو بە بۆچوونەكەی دەناسرێتەوە، بۆچوونی خراپ، وە داوای تەوبەی لێ دەكرێت، ئەگەر تەوبەی كرد باشە ئەگەر نا دەكوژرێ.

**٢٥٠** - لە ابن أبي الزناد، لە باوكیەوە، وتی: حەڕوریەكان دەرچوون لە عێڕاق، لە خیلافەتی عمر بن عبدالعزیز، منیش ئەو ڕۆژە لە عێڕاق بووم لەگەڵ

عبدالحميد بن عبدالرحمن بن زيد بن الخطاب، جا عمر بن عبدالعزيز نامەیەكی بۆ ناردین، فەرمانی پێ دەكردین كە بانگیان بكەین بۆ كاركردن بە كتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەرەكەی ﷺ، جا كە كەمتەرخەمی كرد لە بانگەشە كردنیان، نامەی بۆ نارد كە جەنگیان لەگەڵ بكا، چونكە سوپاس بۆ الله؛ الله هیچ سەلەفێكی بۆ دانەناون كە بەڵگەی پێ بهێننەوە لەسەرمان، عبدالحمید یش سوپایەكی ناردە سەریان، حەڕوڕیەكان ئەوانیان بەزاند، كە ئەمە گەیشتەوە بە عمر، مسلمة بن عبدالملك ی ناردە سەریان لە سوپایەك لە خەڵكی شام، وە نامەی بۆ عبدالحمید نارد: پێم گەیشت كە سوپاكەت چی كرد، سوپایەكی خراپە، مسلمة بن عبدالملك م بۆت ناردووە، واز لە نێوان ئەو و ئەوان بێنە، جا مسلمة بن عبدالملك گەیشت بەوان و دواتر الله سەری خست بەسەریاندا وە بەو بەزاندنی.

ابن عباس **رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما** فەرمووی: گوێم لە عمر بن الخطاب بوو لەسەر مینبەر، دەیفەرموو: كەسانێك دێن لەم ئوممەتە بەرد باران بە درۆ دەخەنەوە، وە دەجال بە درۆ دەخەنەوە، وە هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە بە درۆ دەخەنەوە، وە سزای ناوگۆڕ بە درۆ دەخەنەوە، وە شەفاعەت بە درۆ دەخەنەوە، وە دەرچوونی كەسانێك لە ئاگر دوای ئەوەی بوونە بە پشكۆ بە درۆ دەخەنەوە، ئەگەر پێیان بگەم دەیانكوژم بە كوشتنی عاد و ثەمود.

**٢٥٢** - ابن القاسم دەربارەی ئەهلی ئارەزووەکانی وەکو قەدەری و ئیباضی و هاوشێوەکانیان لە ئەهلی ئیسلام، لەوانەی لەسەر بێجگە لەوەن کە کۆمەڵی موسڵمانانی لەسەرە، لە بیدعە و تەحریفی کتێبی اللە، و لێکدانەوەی لەسەر غەیری لێکدانەوەکەی خۆی .

وتی: ئەوانە داوای تەوبەیان لێ دەکرێت، دەریبخەن یان بیشارنەوە، ئەگەر تەوبەیان کرد باشە ئەگەر نا دەدرێت لە گەردنیان، لەبەر تەحریفیان بۆ کتێبی اللە، وە لەبەر جیاوازیان کۆمەڵی موسڵمانان و شوێنکەوتووانی رسول اللە ﷺ هاوەڵانی، بەمە پێشەوایانی ڕێنمونی بەمە کاریان کردووە.

عمر بن عبدالعزيز وتی: بۆچوونەکە ئەوەیە کە داوای تەوبەیان لێ دەکرێت، ئەگەر تەوبەیان کرد باشە ئەگەر نا شمشێریان نیشان دەدرێ و لە گەردنیان دەدرێ، وە هەر کەس لەوانە کوژرا لەسەر ئەوا میراتیەکەی بۆ میراتگرەکەیەتی، لەبەر ئەوەی ئەوان موسڵمانن، تەنها ئەوە نەبێ کە لەبەر بۆچوونەکەیان کوژراون، بۆچوونە خراپەکانیان.

عیسى وتی: هەر کەس وتی: اللە قسەی لەگەڵ موسا نەکردووە، داوای تەوبەی لێ دەکرێت، ئەگەر تەوبەی کرد باشە ئەگەر نا دەکوژرێ، ئەمەش بە حەق و واجب دەزانم و هەر ئەمەیە کە دینداری بۆ اللە پێ دەکەم.

**٢٥٣** - العتبي وتی: پرسیار لە سحنون کرا دەربارەی ئەو کەسەی وتویەتی: جبریل هەڵەی کرد لە وەحیدا، بەڵکو پێغەمبەر علي بن أبي طالب بوو، تەنها

ئەوە نەبێ کە جبریل هەڵەی کرد لە وەحیدا! ئەمە ئەهلی تەوبە پێکردنە، یان دەکوژرێت بە بێ تەوبە پێکردن؟

وتی: بەڵکو داوای تەوبەی لێ دەکرێت، ئەگەر تەوبەی کرد باشە ئەگەر نا دەکوژرێت.

پێی وترا: ئەی ئەگەر جنێوی دا بە یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ : أبا بکر، عمر، یان عثمان، یان علي، یان معاویة، یان عمرو بن العاص؟

پێی وتم: ئەمما ئەگەر جنێوی پێ دان، وتی: ئەوانە لەسەر گومڕایی و کوفر بوون، ئەوا دەکوژرێت، بەڵام ئەگەر جنێوی پێیان دا بە جگە لەمانە وەکو چۆن خەڵکی جنێو دەدەن، وای دەبینم سزا بدرێن بە سزایەکی توند.

**٢٥٤** - معن وتی: لە عەرەبەوە نامە بۆ مالك نوسرا، پرسیاری دەکرد دەربارەی کەسانێك کە دوو ڕکات نوێژ دەکەن بەڵام نکۆڵی لە سوننەت دەکەن، وە دەڵێن: نوێژ نابینین جگە لەم دوو ڕکات نوێژە .

مالك وتی: وای دەبینم داوای تەوبەیان لێ بکرێت، ئەگەر تەوبەیان کرد باشە ئەگەر نا دەکوژرێن.

**٢٥٥** - ابن القاسم وتی: هەر کەس لە موسڵمانان جنێوی دا بە یەکێك لە پێغەمبەران و نێردراوان، دەکوژرێت و داوای تەوبەی لێ ناکرێت، ئەو لە جێگەی ئەو زندیقەیە کە تەوبەی بۆ نیە، بۆیە تەوبەی لێ داوا ناکرێ، چونکە بە زمانی

تەوبە دەكا بەڵام بە نهێنی دەگەڕێتەوە، بۆیە تەوبەی بۆ نیە، وە ئەو لە جێگەی ئەو كەسەیە كە جنێوی داوە بە رسول الله ﷺ، چونكە الله لە كتێبەكەیدا فەرموویەتی: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ﴾ [البقرة: ٢٨٥].

وە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمۡ يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ﴾ [النساء: ١٥٢].

وە فەرموویەتی: ﴿فَإِنۡ ءَامَنُواْ بِمِثۡلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا هُمۡ فِي شِقَاقٖۖ فَسَيَكۡفِيكَهُمُ ٱللَّهُۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ [البقرة: ١٣٧].

محمد وتی: وتەی پێشەوایانی ڕێنمونی و خاوەنانی عیلمم فێر كردی لەوەی پرسیارت دەربارەی كرد و لە بێجگە لەوەش كە پرسیار دەربارەی دەكرێ، لە "بنچینەكانی سوننەت" كە ئەهلی ئارەزووە گومڕاكەرەكانی پێچەوانەی كتێبی الله و سوننەتی نێردراو و پێغەمبەرەكەیان تێیدا كردووە ﷺ، خۆ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە كە گەورە زانایان ڕقیان لێیە شتێك لە قسەكانیان بنوسرێتەوە و لە كتێبێكدا بە نەمری هەڵبگیرێن؛ ئەوا لادان و گومڕاییەكانیانمان پێ ڕادەگەیاندنی كە وات لێدەكا زیاتر لێیان هەڵبێیت، وە پەنا بە الله دەگرین لە فیتنەكانیان، الله ئێمە و تۆش بپارێزێ لە فیتنە گومڕاكەرەكان، وە تەوفیقمان بدا بۆ ئەوەی كە ڕازی دەكات وتە بێ یان كردەوە، وە نزیكمان بكاتەوە لێی، و صلى الله على نبينا محمد و على آله و صحبه و سلم تسليما.

إبن أبي زَمَنِين المَالكِي ئەڵێت :

(بیانوو بوونی نیە بۆ کەسێکی نەزان کە وازبهێنێت لە پرسیارکردن و گەڕان بە دوای بنەماکانی ئیمان و دین و شەریعەتەکانی موسڵمانان، لە کاتێکدا الله ﷻ ئەو کارەی لەسەر پێویست کردووە بە فەرمایشتی : {فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ} [النحل : ٤٣]. وە بەهەمان شێوەش بیانوو نیە بۆ زانایەك لە شاردنەوەی ئەوەی پرسیاری لێ دەکرێت لەوەی کە قورئان دەربارەی هاتووەتە گۆ، یان سوننەتێکی جێگیر لە کەسێك کە نایزانێت، لەبەر ئەو بەڵێنەی الله ﷻ وەریگرتووە لە زانایان لە فەرمایشتی : {لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُ} [آل عمران : ١٨٧]، تەوفیقیش نیە مەگەر لای الله نەبێت، پشتم بەو بەستووە و بۆ لای ئەویش دەگەڕێمەوە .